# بەیداخ هەڵگرانی ڕێبازی حسامی





**نووسینی: شێخ محمد عەلی حسامی نەقشبەندی**

**پێداچوونەوەی: مەلا محمد بەکر گەرمیانی**

# بسم الله الرحمن الرحيم

[الذين يوفون بعهد الله ولاينقضون الميثق ۞ والذين يصلون ما أمر الله به أن يوصل ويخشون ربهم ويخافون سوء الحساب ۞ والذين صبروا ابتغاء وجه ربهم وأقاموا الصلوة وانفقوا مما رزقنهم سرا وعلانية و يدرءون بالحسنة السيئة أولئك لهم عقبى الدار ۞ جنت عدن يدخلونها ومن صلح من آبائهم وأزواجهم وذريتهم والملئكة يدخلون عليهم من كل باب ۞ سلم عليكم بما صبرتم فنعم عقبى الدار]

((صدق الله العظيم))

(الرعد: ٢٠ ـ ٢٣)

## ( پێداچوونەوە لەم کتێبەدا )

## الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على شمس الضحى نور الهدى بدر الدجى سيدنا محمد من أرسله الله رحمة للعالمين و على آله وأصحابه ومن تبعه الى يوم الدين

لەپاش پێداچوونەوەم لەم کتێبەدا کە لەنووسینی مورشیدو ئوستادمان حەزرەتی (شێخ محمد عەلی حسامی نەقشبەندی)یە (قدس سره) ناوەڕۆکەکەی ئەوەی بۆ دەرخستم کە لەڕاستیدا کتێبێکی زۆر گرنگ و بەسوودە بۆ موسوڵمانان و بەتایبەت ئەهلی تەریقەت و پەیڕەوانی ڕێبازی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) چونکە تیایدا کۆمەڵێك ڕاستی خراوەتەڕوو لەبارەی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی حسامەدین و جێگەدارەکانیەوە (قدس سرهم) کە زەمەنێکە شتانێکی ناڕاست و چەواشەکاری جێگەی گرتوەو ئەو ڕاستیانەی شاردوەتەوە. هەربۆیە بەوەسیلەی ئەم نووسراوەوە هەموو ئەو ڕاستیانە ئاشکرا دەبێت و ئیتر ئەو چەواشەکاریانە دەچنە ژێر خاك. هیوادارم خوێنەرانی بەڕێز بەچاوێکی ئیمانیەوە تەماشای بەکەن و دوور لەچاوی ڕەخنەی دەمارگیری چونکە ڕەخنەگری دەمارگیر ناتوانێت ڕاستیەکان ببینێت و بەرچاوی ڕەش دەبێت لەئاستیاندا هەربۆیە هیچ سوودێکی پێ ناگات، وەپێویستە بزانین کە مەبەستی ئەم نووسراوە خزمەت کردنە بەڕێبازی ئەو پیاوچاکانەی کە بەڕاستی ڕێگەی خودایان گرتووە وەڕوون کردنەوەی ڕاستیەکانی ژیانیانە تاوەکو بۆ موسوڵمانان ببێتە ڕێنوێنی و ڕۆشنایی و خۆپاراستن لەهەموو ئەو ڕێگانەی کە مرۆڤ بەرەو هەڵدێرو سەرلێشێوان دەبات (خودا پەنامان بدات).

شایانی باسە ئەوەی کە بەندەی هەژار لەم پێداچوونەوەدا ئەنجامم داوە گۆڕانکاری لەهەندێك ووشەو ڕستەدا بووە چونکە لەهەندێك شوێندا پێویستی بەگۆڕانکاری دەکرد تاوەکو ئاسانترو ڕوونتر بۆ خوێنەری بەڕێز بدا بەدەستەوە. هەروەها تەخریج کردنی ئەو

حەدیسانەی کە لەم کتێبەدا بەکارهاتوون پێویستیەکی دیکە بوو کە دەبوایە ئەنجام بدرێت تاوەکو ببێتە سەرچاوەیەك و زانیارییەکی زیاتر لەبەردەم خوێنەردا (بۆ ئەو مەبەستەش سوود لە مەکتەبە شامیلە وەرگیراوە). وەهەروەها بەهۆی گرنگی ئەم نووسراوەوە بە پێویستم زانی کە هەندێك بابەتی تری بۆ زیادبکەم کە بوونی ئەو بابەتانە لەم کتێبەدا پێویست بوو ئەویشبەمەبەستی شارەزاییەکی زیاترو بەسوود بۆ هەموو خوێنەران وەئەو بابەتانەش بریتین لە (شەجەرەی نەسەبی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره)) وە (سیلسیلەی بنەڕەتی ئیرشادی حەزرەتی حسامەدین و جێگەدارەکانی (قدس سرهم)) وە (نووسەر لەچەند دێرێکدا).

وصلى الله وسلم على سيدنا ومولانا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين

بەندەی هەژار

محمد بکر گەرمیانی

بەروار: (٥|٩|٢٠١٤)ی زاینی

بەرامبەر بە: (١٠)ی (ذي القعدة)ی

(١٤٣٥)ی کۆچی

* * *

## ( پێشەکی )

الحمد لله حق حمده والصلوت والسلام علی خیر خلقه سیدنا وحبیبنا محمد وعلی آله الأطهار وصحابته المنتجبین الأخیار أما بعد:

خودایە حەقمان وەك خۆی پیشان بدەو لەو کەسانەمان بگێڕە کە شوێنی کەوتون وەباتڵمان وەك خۆی پیشان بدەو لەو کەسانەمان بگێڕە کە خۆیان پاراستوە لێی.

پاش بڵاوبونەوەی هەندێك نوسراوو دەنگۆی ناڕاست لەبارەی بەسەرهات و سەرگوزەشتەی مورشیدو جێگەدارەکانی ڕێبازی پیرۆزی حسامی نەقشبەندیەوە، بەندە وەك جێگەدارو پەروەردە کراوی دەستی ئەو مەردە مەزنانەی مەیدانی تەریقەت و تەقوا هەستم بە بەرپرسیاریەتی بەرپەرچ دانەوەی ئەو دەنگۆو نووسراوە چەواشەکاریانە کرد کە لەلایەن بێ باوەڕانەوە بڵاوکرابویەوە لەناو هاوولاتیانی ناوچەکانی کوردستان بەگشتی و پەیڕەوانی ئەو مورشیدە مەزنانە بەتایبەتی. بەوهۆیەوە هەستام بەنووسینی ڕاست و دروستی ژیاننامەی مورشیدو جێگەدارەکانی ڕێبازی حسامی لە دوو تویی ئەم کتێبەداو ناوم نا (بەیداخ هەڵگرانی ڕێبازی حسامی) کە لە چوار بەش پێك هاتووە. ئەمەش بەیارمەتی و لوتفی خودای تعالی وەفەیزو هیمەتی پیرانی بێشەی حەقیقەت و مەعنەویەت.

سوپاس بۆ پەروەردگاری مەزن کە تەوفیقی پێ بەخشیم و توانیم ساڵی پار کتێبی کورتەیەك لە ژیاننامە و خەواریقی حەزرەتی حسامەدینی نەقشبەندی (قدس سره) کە لەنووسینی مەرحومی مەلا عەلی ئەفەندیە وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی بەناونیشانی (کورتەیەك لە سراج الطالبین). هەربۆیە لەم کتێبەدا تەنها چەند ڕیوایەتێکم هێناوەتەوە کە لە زمانی زاناو خەلیفە دادپەروەرەو باوەڕ پێ کراوەکانەوە بیستوومە وەئەو ڕیوایەتانەش لەبارەی بەسەرهاتی گرنگی ژیانی حەزرەتی حسامەدینە و (قدس سره) پەیوەندی بەدەرخستنی ئەو ڕاستیانەوە هەیە کە لەسەرەوە ئاماژەم پێدان، وەئەم بەسەرهاتانەش لەپاش

وەفاتی مامۆستا مەلا عەلی ئەفەندی (بەڕەحمەت بێت) لەژیانی حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سره) ڕوویانداوەو لەوەو پێش نەنوسراونەتەوە.

هەروەها هەندێك نووسەر لەبارەی بەسەرهات و ژیانی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم و حەزرەتی شێخ ئەحمەد نورەدینی جێگەداریەوە (قدس سرهما) چەند باسێکی کورتیان نووسیوە کە ئەو نووسراوانەش بۆ خۆیان دووبەشن:(بەشی یەکەمیان لەگەڵ ڕێزو پێزانین بۆ کارەکانیان کە لەبارەی ژیانی ئەو دوو مورشیدە پایە بەرززەوە وەکو خۆی و بەئەمانەت پارێزیەوە قەڵەمیان بەکارهێناوەو بەهیچ شێوەیەك فریوی مەکری بێ باوەڕانیان نەخواردوە لەپێناو دەسکەوتی ماددی و بەرژەوەندی تاکە کەسی، وەخۆیان لە دروست کردنی ووتەی ناڕاست لەوبارەیەوە پاراستوە بەڵام بەهۆی نەبونی زانیاری تەواو لەسەر ژیانی ئەو دوو مورشیدە پیرۆزە لەبەر دەستیاندا یان هەر هۆکارێکی دیکە نەیانتوانیوە هەموو ئەو ڕووداوو بەسەرهاتە گرنگانەی ژیانیان بنووسنەوەو زۆر بەکورتی باسیان لێوە کردوون. وەبەشی دووهەمیان سەرەڕای ئەوەی بەکورتی ژیاننامەی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم و حەزرەتی شێخ ئەحمەد نورەدینی حسامی نەقشبەندیان (قدس سرهما) نووسیوەتەوە زۆرێك لەڕاستی بەسەرهاتەکانی ژیان و چۆنیەتی ئیرشادەکانیشیان پەردەپۆش کردوەو بەئاشکرا بێ باوەڕی خۆیان بەو ڕێبازە پیرۆزەو مورشیدە مەزنەکانی بەخوێنەری نووسراوەکانیان ڕاگەیاندوە بەجۆرێك کە بەزەقی ئەو ناڕاستیانە دەرکەوتووە لە نووسراوەکانیاندا).

هەرلەبەر ئەو هۆیانەی کە لەسەرەوە باسکران بەندەی نووسەر بە دورو درێژی ڕاستی بەسەرهات و گرنگترین ڕووداوەکانی ئیرشادو ژیانی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم و حەزرەتی شێخ ئەحمەد نورەدینی حسامی نەقشبەندیم (قدس سرهما) بەبەڵگەی ڕاستی بیستراوو نووسراوەوە خستوەتە ڕوو لەم کتێبەدا تاوەکو خوێنەری باوەڕدارو پەیڕەوانی

موخلیسی ڕێبازی پیرۆزی (حسامی نەقشبەندی) هەموو ڕاستیەکانیان بۆ ئاشکرا بێت و بەهیچ شێوەیەك نەکەونە ناو بۆسەی بێ باوەڕانی چەواشەکارەوە وەفریوی دروست کراوی خەیاڵات و مەکرەکانیان نەخۆن و ئیدی لەمەودوا باوەڕیان پێ نەکەن. هەرچەندە وادیارە ئەو فەرموودەیەی حەزرەتی محمد (صلی الله علیەوسلم) لەم سەردەمەدا ئاماژەکانی دەرکەوتووە کەوا یەکێك لە ئەسحاب عەرزی دەکات و لێی دەپرسێت ((متى الساعة، قال (علیه الصلوات والسلام) اذا اسند الأمر إلى غير أهله فانتظر الساعة))* واتە: کەی ئاخر زەمان دێت؟ لەوەڵامدا ئەو حەزرەتە دەفەرموێت هەرکاتێك کاروبار سپێردرا بەکەسانی نەشیاو ئەوا چاوەڕێی کۆتایی دونیاو ئاخر زەمان بە. هیوادارم ئەم فەرموودەیە بۆ ئەم سەردەمە نەبێت و بەم جۆرە نووسراوانە ڕێگە لەو نائەهل و نەشیاوانە بگیردرێت و مەیدانیان بۆ چۆڵ نەکرێت.

لەکۆتاییدا هەرچەندە ویستی خودای مەزن ئەوەبوو کە شەرەفی حزورم لەخزمەت حەزرەتی بەهائەدینی دووهەمدا (قدس سره) نەبێت بەنسیب بەڵام سوپاس بۆ پەروەردگاری بێ هاوتا بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەخزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەد نورەدیندا (قدس سره) سوودی مەعنەوی و ڕۆحیم لە پەروەردەو ئیرشادەکانی وەرگرت بەوهۆیەوە توانیم زیاتر لەبارەی ڕاستیەکانی ژیان و ئیرشادەکانی ئەو حەزرەتەوە بنووسمەوەو دووبەشی کۆتایی ئەم کتێبەم کە بریتی یە لە (بەشی سێهەم و چوارەم) تەرخان بکەم بۆ ئەو بابەتانە.

* أخرجه البخاري في (صحيحه) (٢١|٣٨٣)، وإمام أحمد في (مسنده) (١٧|٤١٦)، والبيهقي في (سننه) (٢|٤٤٩)، والسيوطي في (جامع الأحاديث) (٣|٣٣٤)، والنووي في (رياض الصالحين) (٢|٣١٢)، والقرطبى في (التذكرة) (١|٧٢٦).

شایانی باسە زۆرێك لە دۆستو کەسوکارو پەیڕەوانی بەوەفاو دڵسۆزی ئەو ڕێبازە پیرۆزە داوایان لێکردم کە ئەم کتێبە بنووسمەوە بەتایبەت جەنابی شێخ عەدنانی حسامی نەقشبەندی (خودا بیپارێزێت) کە زۆر جەختی دەکردەوەو هانی دەدام تاوەکو ڕووی ڕاستەقینەی چەواشەکارانی بێ باوەڕ بەهۆی نووسینی ئەم کتێبەوە بۆ ئەهلی تەریقەت و خوێنەرانی بەڕێز بخەمەڕوو.

داواکارم لە پەروەردگاری جیهان کە بەهۆی نووسین و بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبەوە لەتاوانەکانم خۆش بێت (بەندە نالێم تاعەتەکانم قەبوڵ بفەرموو بەڵکو قەڵەمی عەفو بەسەر تاوانەکانمدا بکێشە)[1] هەروەها داواکارم خوای گەورە پاداشتی ئەو کەسانە بداتەوە کەلەم کارەدا هاوکاریان کردم بەتایبەت خوێندکاری چالاك و ئازیز مەلا محمد بەکر گەرمیانی کە هەوڵو کۆششێکی بێ وچانی لە پێداچونەوەی ئەم کتێبەدا ئەنجامدا. هیوادارم خوێنەری باوەڕدارو خۆشەویست لە دۆعای خەیر بێ بەشمان نەکات و ئەم بەرهەمە ببێتە هۆی بەرزبوونەوەی زیاتری پلەو پایەی حەزرەتی حسامەدین و حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم و حەزرەتی شێخ ئەحمەد نورەدینی حسامی نەقشبەندی (قدس سرهم) وەڕۆحیان شادبێت و پاداشتی زۆرو فراوانیان دەست بکەوێت لەلایەن خودای مەزنەوە "آمین".

وصلى الله على سيدنا وحبيبنا محمد وآله وصحبه الأبرار

شێخ محمد عەلی حسامی نەقشبەندی

بەرواری: (٢|٩|٢٠١٤)ی زاینی

بەرامبەر بە: (٧)ی (ذي القعدة)ی

(١٤٣٥)ی کۆچی

---

[1] گوڵستانی سەعدی کە لە نووسینی شێخ سەعدی شیرازیە (قدس سره) ..................... نووسەر.

وێنەی ژمارە: (١)



(حەزرەتی شێخی حسامەدین (قدس سره)

## (( بەناوی خودای مەزن و میهرەبان ))

## (گێڕانەوەی چەند بابەتێکی گرنگ لەژیانی حەزرەتی شێخی حسامەدین (قدس سره))

وەکو ئاشکرایە بۆ هەموو ئەوانەی کە خاوەن باوەڕن ڕێبازی پیرۆزی نەقشبەندی خزمەتێکی بێ ئەندازەی لەزۆربەی بوارەکاندا گەیاندوە بەمرۆڤایەتی بەگشتی و بەموسوڵمانان بەتایبەتی کەلە هەموویان گرنگتر بێ نیازبوون و قەناعەتکردنە بەماڵی دونیا کە مورشیدەکانی ئەو ڕێبازە پیرۆزە ئەو ڕەوشتە بەرزەیان لەخۆیاندا جێبەجێ کردوە وەپەیڕەوان و موریدەکانیشیان لەسەری ڕاهێناوە هەروەها هەوڵیانداوە لەهەموو بەشەکانی ژیانیاندا ڕەنگ بداتەوە، وەلەهەمان کاتدا ئەو مورشیدە مەزنانە وەکو هەموو سەردارانی چاکە خوازی ورزگاری کاری مرۆڤایەتی بێ بەش نەبوون لە دژایەتی گومڕاهان و پیلان گێڕی بێ باوەڕان، ئەمەش بەهۆی مەزنی وکاریگەری ئەو ڕێبازەو مورشیدە بەتواناکانی بووە کە تەئسیریان لەدڵ و هەستی مرۆڤەکاندا دروست کردووە.

هەر بەوهۆیەوە لێرەدا بەپێویستی دەزانم لەبارەی یەکێك لەمورشیدە مەزنەکانی ئەو ڕێبازەوە بدوێم کەئەویش (حەزرەتی شێخی حسامەدین نەقشبەندیە(قدس سره))، وەخستنە ڕووی چەند باسێك کە پەیوەندیان بەپێش وەفاتی ئەو حەزرەتەوە هەیە هەروەها باسکردن و ڕوون کردنەوەی هەندێك لەو پیلان و چەواشەکاریانەی کە لەپاش وەفاتی ئەو حەزرەتە لەلایەن بێ باوەڕانەوە داڕێژرابوون لە دژی خودی ئەو زاتەو ڕێبازەکەی و جێگەدارەکانی، وەپێویستە پەردەیان لەسەر لابدەین تاوەکو بۆ هەموو باوەڕداران ڕوون ببێتەوە ئەمەش بەپشت بەستن بەوبەڵگەنامەو شاهیدانەی کەمن لە خزمەتیاندا سودمەند بووم.

هەروەها بەهۆی ئەوەی لەسەردەمی ئەو حەزرەتەدا کەسانێکی عادل و پاك ودڵسۆز هەبوون کە ڕاستیەکانی ژیان وخووڕەوشتی (حەزرەتی حسامەدین)یان (قدس سره) بەبەڵگەو

ئەمانەت پارێزیەوە گەیاندووە بەئێمەو لەبەر بەرژەوەندی هیچ گروهو دەستەیەك یاخود بەرژەوەندی تاکە کەسی بەهیچ شێوەیەك گۆڕانکاری و چەواشەکاریان لەڕیوایەتەکانیاندا نەکردوە، وەنموونەی ئەو کەسە دادپەروەرانەش هەردوو زانای مەزن و پایەبەرز (سەید ئەحمەد ئەقرەع) خاوەنی کتێبی (السعادة الأبدیة)و مەلاعەلی ئەفەندی حسامی خاوەنی کتێبی (سراج الطالبین)ن (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) کە بەجوانترین شێوەو وەکو خۆی ڕاستیەکانی ژیانی حەزرەتی (حسامەدین)یان (قدس سره) بەئێمە گەیاندووە، هەربۆیە هەموو ئەو کەسانەی کە بەئیخلاسەوە شوێنکەوتووی ڕێبازی ئەو حەزرەتەن تەنها باوەڕو متمانە بەوجۆرە سەرچاوانە دەکەن و شوێن ئەو نووسراوو سەرچاوانە ناکەون کە تێکەڵەیەکە لەڕاستی و هەڵبەستراوو چەواشەکاری تاوەکو بەوهۆیەوە سوود بگەیەنن بەگروپ و کەسانێك کەبەکردار دژایەتی خۆیان ڕاگەیاندوە بەرامبەر بەو ڕێبازە پیرۆزەو لەگەورە بیّ باوەڕان ئەژمار دەکرێن[٢].

---

[٢] لەزانستی دەرون ناسیدا باسی ئەو شێوازە نووسینە کراوە کە بەرژەوەندی سیاسی یا کۆمەڵایەتی و ماددی لایەنێکی تیادا تێهەڵکێش کراوە وەزانایانی ئەو زانستە لەم بارەیەوە بەم شێوە پێناسەی دەکەن کەوا ئەو جۆرە نووسەرانە بەسوود وەرگرتن لەڕاستیەکان و تێهەڵکێش کردنی ئەو ڕاستیانەش لەناو چەواشەکاریەکانیاندا دەیانەوێت خوێنەرانی کتێبەکانیان بەلاڕێدا بەرن و هەموو ئەو ناڕاستیانە بەهۆی ئەو کارەیانەوە بەڕاست بخەنە بەرچاوو دڵ و مێشکیان وەئەو ڕاستیانەش بکەنە نموونەی ئەوەی کەوا کتێبەکەیان هەموو پڕە لە ووتەو ڕستەی ڕاست و بیّ کەموکوڕی هەروەها هەندێکی دیکە لەوجۆرە نووسەرانە لە نووسینەکانیاندا ڕیوایەت و قسەی ڕاست و دروست بەزۆری بەکاردەهێنن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەچەند ڕستەیەك یاخود لاپەڕەیەکی کەمداو بەجیا جیا مەبەستە ناڕەواو چەپەڵەکانی خۆیانی تێدا دەگونجێنن، هەربۆیە ئەم گروپەیان بەهێزترو کاریگەر ترن لەوەی یەکەم لە چەواشەکاری و سەرلێشێوانی خوێنەردا ........................... نووسەر.

سەرەتای گەشەسەندن و بەهێزبونی ئەم جۆرە دەستەو تاقمە لەکاتێکدا بوو کە جەنگی جیهانی دووهەم کۆتایی هاتوو سەردەمی جەنگی سارد دەستی پێکرد ، وەیەکێك لەو دەسەڵاتانەی کە لەپاش ئەو جەنگە زۆر سوودی بەوتاقمە بێ باوەڕە گەیاند هەندێك لە دەسەڵاتداران و حاکمەکانی ناوچەکە بوون وەلەبەرئەوەی کە ئەهلی تەریقەت بەشێکی کاریگەری ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو لەوسەردەمەدا وەلەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو هەربۆیە بێ بەش نەبوون

لەو هێرش و پیلانانەی کە ناحەزان لەدژیان دەیانگێڕا بەتایبەت لەدوای ڕاگەیاندنی حزبی شیوعی و هاتنە سەرکاری دەسەڵاتی عبدالکریم قاسم کە هەوڵێکی زۆریان دەدا بۆ شێواندن ولاوازکردنی ئەو ڕێبازە پیرۆزانەو بەتایبەت ڕێبازی نەقشبەندی. بەوهۆیەوە ئێمە لێرەدا باسی هەندێك لەو پیلان و چەواشەکاریانە دەکەین کەلەوکاتەدا دژ بە یەکێك لەمورشیدەکانی ئەو ڕێبازە پیرۆزەو جێگەدارەکانی ئەنجام دراوە ئەوانیش (حەزرەتی حسامەدین و حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم و حەزرەتی شێخ ئەحمەد )ن (قدس سرهم) کە ئەم مورشیدانە بەربەستێکی بەهێزبوون لەبەردەم ئەو پیلان و پرۆگرامە ناڕاست وگومڕاکەرانەداو ڕێگەیان نەدەدا بەئامانجی خۆیان بگەن کە بریتی بوون لە نەهێشتنی ئاین و ڕەوشتە پیرۆزەکان وئاداب و بیروباوەڕی شوێنکەوتوانی ئەو ڕێبازە پیرۆزانە لەناو کۆمەڵگادا.

هەربەو هۆیەوە ئەو گروپو تاقمە بێ باوەڕە بەهۆی نائومێدبونیان لەگەیشتن بەئامانج پەنایان بردەبەر بڵاوکردنەوەی هەندێك هەڵبەستراوو چەواشەکاری دژ بەو مورشیدە پایە بەرزانە بەتایبەت حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم و حەزرەتی شێخ ئەحمەد نورەدین (قدس سرهما) ، کە بەپشتیوانی خودای مەزن لەم کتێبەدا هەندێك لەو ناڕاستی و

**چەواشەکاریانە بەبەڵگەوە ئاشکرا دەکەین و پێچەوانەکانیان دەسەلێنین.**

**وەکو پێشتر باسمان کرد لەبەرئەوەی کە پارێزراوبن لە هەڵخەڵەتاندنی ئەو چەواشەکارانە پەیڕەوانی ڕاستەقینەو موخلیسی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) بێجگەلە نووسراوو کتێبی ئەو زاناو نووسەرە دادپەروەرانە پشت بەهیچ نووسراوێکی دیکە نابەستن لەبارەی ژیان و بەسەرهاتی حەزرەتی حسامەدین و جێگەدارەکانی (قدس سرهم) وەهەر نووسراوێك کە بڵاودەکرێتەوە تاوەکو بەتەواوی لێکۆڵینەوە نەکەن لەبارەی کتێبەکەو نووسەرەکەیەوە ئەوا متمانەو باوەڕی پێناکەن ئەوەش لەبەر چەند هۆیەکە کەلێرەدا ئاماژەی پێدەکەین:**

**یەکەم: بەهۆی ئەو پیلان گێڕی و دژایەتیەوە کە پێشتر باسمان کرد.**

**دووەم: بەهۆی شوێنکەوتنی زۆربەی خەڵکی ئەم سەردەمە بۆ بەدەستهێنانی ئاوات و ئارەزووە ماددی و دنیایەکانیان وەبەئاسان کڕینی زۆرێك لەم جۆرە کەسانە کە لەناویاندا زاناو نووسەری لێهاتووشیان تێدایەو بەهۆیەوە سوود لەزانست وقەڵەمەکەیان وەردەگرن بۆ گەیشتن بەئامانجە نارەواکانیان.**

**سێهەم: ئەو جۆرە نووسەرانە بێجگەلە گێڕانەوە هیچ زانستێکی کردارییان پێنیە وەلە نووسراوەکانیاندا بەڕوونی دەردەکەوێت کە لەئامانجەکانی ئەو ڕێبازە پیرۆزانە لایانداوەو دەیانەوێت خەڵك بەرەو ڕێگە تاریکەکان ڕێنوینی بکەن، وەلەهەمان کاتدا دەیانەوێت ئەوە بەخوێنەر بسەلێنن کە ئەوانیش تواناو لێهاتووی ئەو نووسەرە مەزنانەی ڕابردوویان تێدایەو**

وەکو ئەوان دادپەروەرن بەڵام مەخابن هیچ کە نەیانتوانیوە وەکو ئەو نووسەرە پایە بەرزانە ڕۆڵ ببینن بەڵکو چەواشەکاری و لادانێکی زۆریشیان خستوەتە ناو یاساکانی تەریقەتەوە. هەرلەم بارەیەوە پێشینانمان فەرموویانە ((قەلەڕەش ویستی چاو لە کەو بکات لەڕێگە ڕۆشتنندا هیچ کە ئەوەی کەو فێرنەبوو ئەوەی خۆیشی لەبیرچوویەوە)).

هەروەها فارس دەڵێت:

خال مه رويان سياهو دانه فلفل سياه

هر دو جان سوزند اما اين كجا وآن كجا[٣]

ئەم جۆرە نووسەرانە بەهۆی ئەوەی کە خۆیان نەگەشتوونەتە خزمەت ئەو زاتە گەورانە هەربۆیە پشتیان بەستوە بەهەندێك بەڵگە کە زۆربەیان هیچ سەرچاوەیەکی ڕاست و دروستی نیە وەلەگەڵ پشت بەستن بەخەیاڵات و ئەو ووتانەی کە وەکو تووتی فێرکراون لەبارەی ئەو مورشیدە مەزنانەوە. هەرلەبەر ئەم هۆکارانەیە کە شوێنکەوتووە ڕاستەقینەکانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) زۆر بەوریایی وئاگاداریەوە دەڕواننە ئەو جۆرە کەسانە و نووسراوەکانیان.

---

[٣] واتە: خاڵی ڕوومەتی ئەو کەسانەی کە ڕوویان وەك مانگە ڕەشە و ناوکی بیبەری تونیش ڕەشە هەردووك گیان دەسووتێنن بەڵام سووتانەکەیان زۆر جیاوازە ......................... نووسەر.

## ( چەند نموونەیەك لەبنەماكانی ڕێبازی پیرۆزی نەقشبەندی )

وەكو لەپێشدا ئاماژەمان پێكرد هەموو كارو كردارو ئامانجی مورشیدەكانی ڕێبازی پیرۆزی نەقشبەندی وەبەتایبەت حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) ئەوە بووە كە ئەو خورەوشت و سیفەتە بەرزو پیرۆزانەی كە خوای تعالی و پێغەمبەری مەزنی ئیسلام (صلی الله علیەوسلم) فەرمانیان كردووە بەئەنجامدانیان لەخۆیان و پەیڕەوانیاندا جێبەجێی بكەن، وەحەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لەم كارەدا توانی سەركەوتووترین مورشیدی ئەو ڕێبازە پیرۆزە بێت چونكە بەباشترین شێوە ئەو باوەڕو ڕەوشتە بەرزانە لەناو مورىدەكانیدا بەدی دەكرا. مورشیدە پایە بەرزەكانی ڕێبازی پیرۆزی نەقشبەندی وەبەتایبەت حەزرەتی ئیمامی ڕەبانی (خودای لێ ڕازی بێت) سەرەكی ترین ئامۆژگاریان بۆ مورىدەكانی ئەو ڕێبازە ئەوە بووە كە هەمیشە پابەندبن بە جێبەجێ كردنی سونەتەكانی حەزرەتی محمدەوە (صلی الله علیەوسلم)، وەئەو پابەند بوونەیان بەیەكێك لەگرنگترین بنەماكانی تەریقەتی نەقشبەندی ئەژماركردووە.

لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە كەوا سونەتەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) یەجگار زۆرەو ئەستەمە كەسێك بتوانێت هەمووی لەخۆیدا بهێنێتەدی ئایا ئەو كەسەی كە بیەوێت شوێنكەوتووی ئەو ڕێبازە پیرۆزەبێت دەبێت هەموو ئەو سونەتانە جێبەجێ بكات یان ئەوەی كەلە توانایدابێت كافیەو فەرمانەكەی حەزرەتی ئیمامی ڕەبانی (قدس سره) ئەنجامداوە؟

لەوەڵامدا دەڵێین مەبەستی حەزرەتی ئیمام لەسونەتەكان تەنها ئەوانە ناگرێتەوە كە ڕۆژانە ئەنجام دەدرێن وەكو (موئەكەدەكان و ڕۆژووی سونەت وخۆبۆن خۆشكردن وبەكارهێنانی سیواك ...... هتد) بەڵكو چەند بنەمایەك لەسونەتدا بوونی هەیە كە دەبێت

شوێنکەوتووانی ئەو ڕێبازە پیرۆزە پابەندبن بە جێبەجێ کردنیان وەلێرەدا چەند نموونەیەك دەخەینەڕوو:

١. پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) دەفەرموویێت (( انما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق)) [*]
واتە: لە ڕاستیدا هۆی بوونم بە پێغەمبەر ئەوەبوو کە خورەوشتە بەرزو جوانەکان بگەیەنمە کۆتا پلەکانی. هەندێك لەو خورەوشتە بەرزو پیرۆزانە کە پێغەمبەری ئیسلام (صلی الله علیەوسلم) لەسروشتیدا نمایان بوبو وەلەسروشتی ئەصحابەکانیدا ڕەنگی دابویەوەو هانی ئومەتیان دەدا بۆ جێبەجێ کردنیان هەر ئەو بنەمایانەن کە حەزرەتی شێخ (محمد بەهائەدینی بوخاری) ناسراو بەشاهی نەقشبەند (قدس سره) دامەزرێنەری ڕێبازی نەقشبەندی بە پەیڕەوان و موریدەکانی ڕاگەیاندوەو کردونی بەسەرەکی ترین بنەمای ئەو ڕێبازەو لەوبارەیەوە دەفەرموویێت (طريقت ما سراسر ادب است، طريقت ما سراسر صحبت است، طريقت ما سراسر محبت است)[٤]

٢. وەفاداری بەرامبەر خۆشەویست و کەسانێك کە خزمەت و چاکەیان بەرامبەر بە مرۆڤەکانی دیکە گەیاندووە یەکێکی ترە لەو بنەمایانەی کە مرۆڤی موسوڵمان و بەتایبەت پەیڕەوانی تەریقەت دەبێت لەخۆیاندا جێبەجێی بکەن، هەرلەم بارەیەوە پێغەمبەر

[*] أخرجه البيهقي في (سننه) (٢|٤٧٢)، والهيثمي في (مجمع الزوائد) (٨|٥٧٣)، والسيوطي في (جامع الأحاديث) (١١|١٣٠)، والمتقي الهندي في (كنز العمال) (٣|٣٣)، والسخاوي في ( المقاصد الحسنة) (١|٢٥٩).

[٤] واتە: ڕێبازی ئێمە هەر هەمووی ئەدەب و ئامۆژگاری و هاوڕێیەتی و خۆشەویستیە ........................ نووسەر.

(صلی الله علیەوسلم) دەفەرمووێت ((من لم یشکر الناس لم یشکر الله))[(٥)*] بەم شێوە دەبینین کە حەزرەتی محمد (صلی الله علیەوسلم) زۆر بەتەواوی ئەم ڕەوشتە بەرزەی پاراستوەو ئەنجامیداوە.

دەگێڕنەوە ((لەکاتی فەتحی مەککەدا ڕیش سپیەکانی ئەصحاب دێنە خزمەت پێغەمبەرو (صلی الله علیەوسلم) عەرزی دەکەن بەهۆی قەرەباڵغی شاری مەککەوە ئەو وەفدانەی کەلە دەرەوە دێن بۆ خزمەتت تاوەکو بەیعەتی موسوڵمان بوون وەربگرن دەبنە هۆی زەحمەت بۆ جەنابت ئەگەر پێغەمبەری خودا (صلی الله علیەوسلم) ڕوخسەتمان بدات ماڵەکەی ئامادەبکەین وچەند حەسیرێکی تێدا ڕاخەین تاوەکو لەو ماندووبون و ئەزیەتە پارێزراوبیت، ئەو حەزرەتەش پێیان دەفەرمووێت لەبری ئەوکارە خەیمەیەکم لەلای گۆڕەکەی خەدیجەی دایکی موسوڵمانان (خودای لێ ڕازی بێت) بۆ هەڵدەن و (لیوای نەسر)یش[(٦)] بچەقێنن بەپاڵ گۆڕەکەیدا ئەسحابەکان هۆکاری ئەم فەرمانەیان نەزانیو بەسەرسوڕمانەوە پرسیان ئایا لەبەر چ هۆکارێك دەبێت وەها کارێك ئەنجام بدەین؟

---

[(٥)] واتە: هەرکەس سوپاسی خەڵك نەکات ئەوا سوپاسی خوداشی پێ ناکرێت ........................ نووسەر.

[*] أخرجه البخاري في (تاريخ الكبير) (٩|٥١)، والترمذي في (سننه) (٧|٤٣٥)، وامام أحمد في (مسنده) (١٢|٤٧٢)، وأبو يعلى الموصلي في (مسنده) (٢|٣٦٥)، والطبراني في (معجم الكبير) (٢|٣٥٦)، والبيهقي في (شعب الايمان) (٦|٥١٦).

[(٦)] لەهەر غەزایەکدا کە موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست بهێنایە پێغەمبەری خودا (صلی الله علیەوسلم) ئاڵایەکی تایبەتی دانابوو کە نیشانەی سەرکەوتن بوو بەناوی (لیواء النصر) وەدەیخستە پێش لەشکری ئیسلامەوە ................ نووسەر.

پێغەمبەر (صلى الله عليەوسلم) لەوەڵامیاندا فەرمووی لەبەرئەوەی خاوەنی ئەو گۆڕە پیرۆزە بەگیان و بەدڵ و بەماڵ و داراییەوە خزمەتی بەم ئاینە کرد وەهەر ئەویش بوو بە بنەمای سەرکەوتنی ئیسلام وگەیشتنی بەم ڕۆژە هەروەها زۆر ئاواتی دەخواست کە چاوی بەم ڕۆژە بکەوتایە بەڵام ویستی خودا ئەوەبوو کە پێش گەیشتنی بەئاواتەکەی لەدونیا دەرچێت و بیباتەوە بۆلای خۆی وەمن بەم کارە پێی ڕادەگەیەنم ئەوا خودا ئاواتەکەی تۆی هێنایەدی وەماندووبون وکۆششەکانت لەپێناو ئیسلامدا شوێنی خۆی گرتوو گەیشتە بەرهەم)). لەم ڕیوایەتەدا بێجگەلە دەرکەوتنی وەفاداری پێغەمبەر (صلى الله عليەوسلم) ئەوەش دەسەلێنێت کە ڕۆحی مردوو هەمیشە ئاگاداری ڕووداوەکانی ئەم جیهانەیە.

هەروەها چەندەها بنەمای دیکە لە سونەتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليەوسلم) بوونیان هەیە کە لە سەرچاوەکانی تەسەوفدا باسیان لێوەکراوە ئێمەش بەهۆی درێژە پێ نەدان و هەروەها درێژی ئەم بابەتانەش کە ناگونجێت لەم کورتیەدا بەتەواوی بخرێتەڕوو کۆتایی بەباسکردنی دەهێنین. وەمەبەستمان لە خستنە ڕووی ئەم بابەتانە ئەوەیە کە بێ باوەڕان وناحەزانی ڕێبازی پیرۆزی حەزرەتی حسامەدین (قدس سرە) چەند چەواشەکاریەکی بێ بنەمایان بڵاوکردوەتەوە لەنێوان موریدەکانی ئەو حەزرەتەدا کە بەهۆی شارەزا نەبوون و بێ ئاگایی هەندێکیان لەزۆربەی بەرنامەکانی تەریقەت باوەڕیان بەو تەحریفات و چەواشەکاریانە کردووەو ڕاستیەکانیان لێ وونبووە.

یەکێك لەو دەنگوباسە ناڕاست و بێ بنەمایانە ئەوەیە کەوا حەزرەتی حسامەدین (قدس سرە) ئەو هەموو هەوڵ وکۆشش و خزمەتانەی بۆیە بەخەڵك گەیاندوە تاوەکو دەسەڵاتی ئەولادەکانی لەناو خەڵکداو بەتایبەتی لەناو پەیڕەوانیدا فراوان بکات وەگوایە هەربەو هۆیەوە وەسیەتی کردوە کە (ئەو ناوچانەی لەژێر کاریگەری مەعنەوی ئەودان ئەوا لەژێر

فـەرمـانی ئـەو کورەیـدا دەبـن کـە لـەو وولاتـەدا نیشـتـەجێیە وەئـەو جێگەداریـەتی لـەو ناوچەیەدا) ، لە حالێکدا ئەم ووتەیە بیٚ بنەمایەو دورە لەڕاستیەوەو بەهیچ جۆرێك لەڕێبازی تەریقەتـدا جێگـای نابێتـەوە وەتاکـە ئامانجیشـیان لـە بلاوکردنـەوەی ئـەم دەنگۆیانـە چەواشەکاری و بەلارێدا بردنی موریدەکانی ئەو حەزرەتەیە.

تاقمێکی دیکەی چەواشەکارانی بیٚ باوەڕو دژ بەڕێبازە پیرۆزەکان ئەو قسە ناڕاستەیان لـەناو نووسـراوو ووتارەکانیانـدا بلاوکردوەتـەوە کـەوا (حـەزرەتی حسـامەدین (قـدس سـره) مورشیدێکی مەزن و پایە بلند بـووە وەقـوتبی زەمـان بـووە بـەڵام هـەموو ئـەو کۆشـش و پلەوپایانەی بۆ کەسە نزیکەکانی خۆی بەکارهێناوەو ختویەتیە خزمەتیانەوە).

لـەوەڵامی ئـەو دوو تاقمـەدا ئێمـە بەڵگـەو نووسـراوی ئـەو حەزرەتـەو ئـەو شـاهیدە عادیلانەی کە لە خزمەتیدا بوون و ئاگاداری هەموو ئەو بابەتە گرنگانـە بـوون بەیارمـەتی خودای مەزن لەم بەشەدا دەیخەینە بەرچاوی خوێنـەری بـەڕێز بۆئـەوەی چـیتر ئـەو ڕاسـتیانە بەشـاراوەیی نەمێننـەوەو بـۆ هـەموو موسـوڵمانان و بەتایبـەت موریـدەکانی حـەزرەتی حسامەدین (قدس سره) ئاشکرا ببێت، کەوا ئـەو حەزرەتـەو مورشـیدە حەقیقیـەکانی ڕێبـازی پیرۆزی نەقشبەندی بێجگەلە جێبـەجیٚ کردنـی بنـەماکانی ئـەو ڕێبـازە پـیرۆزە کـە بریتیـە لەخزمەت کردن بە ئایین ومرۆڤایەتی و زیندوو کردنەوەی سونەتەکانی پێغەمبـەر (صلى الله عليهوسلم) هیچ ئامانجێکی دیکەیان نەبووە.

## ( ئاشکرا کردنی ئەو چەواشەکاریانەی کە لە گێڕانەوەی ململانێکەی پاش وەفاتی حەزرەتی بەهائەدینی یەکەمدا (قدس سره) دروستکران )

یەکێکی دیکە لەو گۆڕین و دەستکاریانەی کە لەسەر گوزەشتی ژیانی حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سره) لەلایەن ئەو دەستەو تاقمە چەواشەکارەوە کراوەو بڵاویان کردوەتەوە ئەوەیە کە گوایە (ئەو حەزرەتە لەپاش بەدەستهێنانی پلەی ئیرشاد لەتەریقەتی نەقشبەندیدا، ئیجازەی ئیرشادی تەریقەتی قادریشی لەلای کاکە ئەحمەدی شێخ یان لەجەنابی شێخ عەلی تاڵەبانی یەکەم (قدس سرهما) وەرگرتووە). بەڵام ئەم دەنگۆیە بێ بنەمایەو دورە لەڕاستیەوە هەرچەندە حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) نێوانی لەگەڵ ئەو دوو زاتە پایە بەرزەدا گەلێك باش بووەو مەحەبەتێکی بێ ئەندازەش لە نێوانیاندا هەبووە بەڵام گێڕانەوەی ڕاستیەکان ئەرکێکی ئاینییە ئەویش لەسەر بنەمای ئەو فەرمایشتەی کە دەفەرموویت ((الساكت عن الحق شيطان اخرس))[(٧)*]

ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە کە هۆکاری ئەو چەواشەکاریانە هەڵوێستی مەردانەو دادپەروەرانەی ئەو دوو زاتە مەزنە بووە لەپشتیوانی کردنیان بۆ حەزرەتی حسامەدین (قدس الله اسرارهم العليه) کە لە کتێبی (کورتەیەك لە سراج الطالبين)دا بەڕوونی باسی لێوەکراوە. ئەوەی کە بەندە بیستومە لەزمانی موبارەکی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامیەوە (قدس سره) لەبارەی وەرگرتنی ئیجازەی ئیرشادی تەریقەتی قادری لەلایەن (حەزرەتی حسامەدین)ەوە

---

(٧) واتە: ئەو مرۆڤەی کە بێدەنگ دەبێت لەبەرامبەر ئەو کەسانەی کە ڕاستیەکان دەشارنەوەو گوتارو کرداری ناڕاست لەجێی دادەنێن ئەوا شەیتانێکی لاڵە و بەستە زمانە ...................... نووسەر.

* نقله الإمام عبدالعزيز البخاري في (كشف الأسرار) (٣|٢٢٣)، والنووي في (شرحه على المسلم) (١|١٢٨)، وامام القشيري في (رسالته) (١|٥٧).

(قدس سره) بەم شێوەیە بووە کە فەرمووی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) تەشریفی برد بۆ سەفەری حەج بەڵام لەبەر چەند هۆکارێك کەلە بەغداد بۆی هاتبووە پێشەوە نەیتوانی فەریزەی حەج بەجێ بگەیەنێت و لەمەرقەدی حەزرەتی عبدالقادری گەیلانی (قدس سره) بۆ ماوەیەك مایەوە پاشان کە تەشریفی گەڕایەوە بۆ باخەکۆن ئێمەش[٨] چوینە خزمەتی بەمەبەستی بەخێر هاتنەوەو بەدەست هێنانی فەیزو بەرەکەت وەبۆ ماوەیەك دەستەو نەزەر لەخزمەتیدا وەستاین، پاشان ئەو حەزرەتە فەرمووی ئەوکاتەی کەلە بەغدا بووم هەموو شەوێك بۆماوەی کاتژمێرێك دەچووم بۆ مەرقەدی حەزرەتی عبدالقادری گەیلانی (قدس سره) و موراقەبەی مەعنەویم دەکرد شەوێکیان ڕۆحی ئەو حەزرەتە ئامادەبوو فەرمووی لەتەریقەتی مندا قوتبی ئیرشاد نەماوە بەهۆی سەختی ڕێبازەکەمەوە وەتۆش دەسەڵاتی ئیرشادی مەعنەویت گەلێك بەهێزە هەربۆیە داوات لێدەکەم ئیرشادی تەریقەتی قادریم لێ قەبوڵ بکەیت تاوەکو لەمەولا کاری مەعنەوی ئەم ڕێبازە بەردەوام بێت.

حەزرەتی شێخ ئەحمەد فەرمووی لەپاش ماوەیەك حەزرەتی حسامەدین (قدس سرهما) نامەیەکی بە واژوو مۆری خۆیەوە نارد بۆ شێخ قادری حسامی سیویە هەتاوەکو لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتدا بڵاوی بکاتەوە کەوا حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لەگەڵ ئیرشادی تەریقەتی نەقشبەندیدا ئیجازەی ئیرشادی تەریقەتی قادریشی بەدەست هێناوەو لەمەودوا موریدەکانی دەتوانن لەو ڕێبازەشدا کاری مەعنەوی ئەنجام بدەن.

یەکێکی دیکە لەو دەنگۆیانەی کە بێ باوەڕان بڵاویان کردوەتەوە لەناو موریدەکانی حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سره) ئەوەیە کە گوایە لەململانێکەی نێوان ئەو حەزرەتەو حەزرەتی شێخ عومەر ضیائەدیندا (قدس سرهما) جەنابی شێخ عەلی تاڵەبانی (قدس سره)

---

[٨] واتە: ئەولادەو نەوەکانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) ....................... نووسەر.

**ئاشتەوایی لەنێوان ئەو دوو حەزرەتەدا کردووە، بەڵام ئەم دەنگۆیەش بێ بنەمایەو دورە لەڕاستیەوە. چونکە ئەوەی کە بەندە لە هەندێك خەلیفەی حەزرەتی حسامەدین** (قدس سره) **بیستوومە ئەوەیە کە دواجار لە عالەمی مەعنەویدا هەندێك نهێنیان بۆ ئاشکرا بووەو ئەو ململانێیە کۆتایی پێ هاتووە[9]. جەنابی شێخ عەلی تاڵەبانی** (قدس سره) **لەو ململانێیەدا پشتیوانێکی بەهێزی حەزرەتی حسامەدین** (قدس سره) **بووە بەوشێوەیەی کە لەکتێبی (کورتەیەك لە سراج الطالبین)دا باسکراوە لە نووسینی مەرحومی مەلا عەلی ئەفەندی هەولێری. هەروەها خودی حەزرەتی حسامەدین** (قدس سره) **چۆنیەتی دروست بوونی ململانێکەو پشتیوانی مەرحومی شێخ عەلی تاڵەبانی** (قدس سره) **بۆ خەلیفە محمد تەوفیقی حسامی پاوەیی** (بەڕەحمەت بێت) **گێڕاوەتەوە[10]، بەندەش ئەو گێڕانەوەیەم بیستوە لەزمانی مەرحومی خەلیفە ئەحمەدی حسامی کوڕی خەلیفە محمد تەوفیق** (بەڕەحمەت بن) **بەم شێوەیەی لای خوارەوە:**

**مەرحومی خەلیفە ئەحمەد فەرمووی کاتێك مەرحومی باوکم دەگاتە پلەی سلوکی مەعنەوی دەبوایە ڕاستەوخۆ خودی حەزرەتی حسامەدین** (قدس سره) **چاودێری و تەوەجوهی مەعنەوی لێ بکردایە وەئەم شێوازەش بۆ هەموو سالکەکانی ئەو ڕێبازە پیرۆزە بەو جۆرە بووە کە کاتێك دەگەشتنە ئەو پلەیە دەبوایە زۆربەی کاتەکان لەژێر چاودێری و تەوەجوهی مەعنەوی ئەو حەزرەتەدابن بەهۆی هەستیاری ئەو پلەیەوە، پاشان خەلیفە ئەحمەد فەرمووی**

---

**[9] یەکێك لەو خەلیفانەی ئەو ڕیوایەتەی بۆ باسکردم مەرحومی شێخ محمدی حسامی بوو ........................ نووسەر.**

**[10] خەلیفەی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) بووە لە شاری پاوەو دەوروبەری ........................ نووسەر.**

باوکم بۆی گێڕامەوەو فەرمووی شەوێکی ساردی زستان لە خزمەتی حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سره) دانیشتبووم دوای ماوەیەك ئاگری سۆبای ژوورەکە کوژایەوەو هەستمان بەسەرمای ژوورەکە کرد لەوکاتەدا ئەو حەزرەتە فەرمووی برا حەمە تەوفیق هەستە هەندێك دار بێنە بۆناو سۆباکە بالەم سەرمایە ڕزگارمان بێت منیش فەرمانەکەیم جێبەجێ کردو دارم هێنا بۆناو سۆباکە لەوکاتەدا دارەکانم بەتنیشت یەکەوە دەخستە ناو سۆباکەوە ئەو حەزرەتە فەرمووی بەتەنیشت یەکەوە دایمەنێ لەخوارەوە بڵاوی کەرەوەو سەرەکانیان باپێکەوەبن باشترە هەم لەسەرخۆ دەسوتێن و هەروەها ژورەکەش زوو سارد نابێتەوە لەوکاتەدا یەکسەر وەسوەسە ڕووی تێکردم و لەدڵی خۆمدا ووتم تەماشای ئەم شێخەکە ئەو هەمووە سەروەت و دەسەڵاتەی هەیەو کەچی لەبەکارهێنانی ئەو دارەشدا ڕەزیلی دەکات.

ئەوەندەی پێنەچوو ئەو حەزرەتە فەرمووی کاتێك کە حەزرەتی بەهائەدین وەفاتی کرد جەنابی شێخ عومەری مامم (قدس سرهما) منی بەجێگەداری ئەو حەزرەتە قەبوڵ کرد بەڵام پاش ماوەیەك هەندێك لە خەلیفەو خزم وکەسوکار ئەم کارەی مامەمیان پێ قەبوڵ نەدەکرا ئەویش بەهۆی کەمی تەمەنی منەوە بەرامبەر بەتەمەن بوون و سلوکی زیاتری مامم لەتەریقەتدا هەر بەوهۆیەوە ڕەخنەیەکی زۆریان لێگرتوو وازیان لێ نەهێنا تاوەکو ناچاریان کرد بەوەی دەستبەرداری ئەو پەیمانە بێت کە بەمنی دابوو، پاشان نووسراوێکیان ئامادەکردو زۆربەی زاناو مورشیدەکانی تەریقەتیش واژوویان لەسەرکردو ناردیان بۆ سوڵتانی عوسمانی کە ئەمەش ناوەڕۆکی ئەو نووسراوەیە ((ئێمەی خاوەنی ئەم نامەو واژووانە جەنابی شێخ عومەری کوڕی شێخی سراجەدین بەشیاوی جێگەداری شێخ محمد بەهائەدینی (قدس سرهم) برای دەزانین ولەم بابەتەدا پشتیوانی لێ دەکەین وەداواکارین لەسوڵتانی عوسمانی پاڵپشتی ئەو زاتە بکات بۆ جێگەداری شێخ محمد بەهائەدینی برای

(قدس سره))).

دواتر وەڵامی سوڵتان بۆ ئەو نووسراوە ڕازی بوون و پاڵپشتی کردن بوو بۆ مامەم. کاتێك ئەو هەواڵەم بیست زۆر غەمبار بووم بەو گۆڕان کاریانە وەتەنها کەسێك لەلای من مابوەوەو پشتگیری دەکردم مەرحومی سەید شەهابەدینی تاڵشی بوو کە خەلیفەی هەردوو حەزرەتی سراجەدین و بەهائەدین بوو (قدس سرهما) یەکسەر چوومە خزمەتی و عەرزم کرد خاڵۆ ئێستا من چی بکەم و ڕوو لەکوێ بکەم تاڕاستی ئەم بابەتە بگەیەنرێتە سوڵتانی عوسمانی ئایا تۆ هیچ چارەسەرێکت لایە بۆ ئەم کێشەیە؟

لەوەڵامدا فەرمووی قوربان گیان لەعالەمی مەعنەویدا بۆم ئاشکرا بووە کە جەنابی شێخ عەلی تاڵەبانی (قدس سره) ڕاستیەکانی ئەم بابەتەی بۆ ئاشکرا بووە هەروەها لەلایەن سوڵتانەوە ڕێزێکی زۆری لێ دەگیرێت و فەرمانەکانی وەرگیراوە، ئەگەر بۆت دەکرێت تادرەنگ نەبووە تەشریف ببە بۆ کەرکوك و خۆت بگەیەنە بەو زاتە تاوەکو پشتیوانیت لێ بکات لە بەدەست هێنانی مافی جێگەداریەکەدا. حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) فەرمووی منیش پاش نوێژی بەیانی سواری ئەسپەکەی حەزرەتی بەهائەدین (قدس سره) بووم و بەرەو کەرکوك بەڕێ کەوتم کاتێك گەیشتمە ئەو شارە نیوەشەو بوو لەیەکەم ماڵ لامدا پیرەژنێکی تێدابوو کە لەیەك ژووریش زیاتری نەبوو داوای ڕوخسەتم لێکردو پێم ووت ئیمشەو میوان ڕادەگری لەوەڵامدا ووتی بەڵێ بەڵام لەم ژوورەو شۆربای ترخێنە زیاتر هیچ شوێن و خواردنێکی دیکەم نیە ئەگەر بەمانە قەناعەت دەکەیت ئەوە ماڵی خۆتەو فەرموو وەرە ژوورەوە پاش نان خواردن و نوێژو حەوانەوەم پیرەژنەکە لێی پرسیم هەرچی سەرنج دەدەم تۆ لەهەورامانەوە هاتوویت وەلە کەسوکاری شێخی بەهائەدین (قدس سره) دەچیت؟

لەوەڵامدا ووتم دایەگیان من کوڕی ئەوم، پاش نوێژی بەیانی و ڕوون بونەوەی ئاسمان

هەندێك منداڵ لەوكۆڵانەدا دەستیان كرد بەیاری كردن چوومە دەرەوەو بانگم كردن لێم پرسین ئایا كەس لەئێوە دەزانێت تەكیەو ماڵی شێخ عەلی تاڵەبانی لەكوێیە؟ یەكێك لەمنداڵەكان ووتی من دەزانم پێم ووت دەتوانی بچیت عەرزی بكەیت كەوا شێخ عەلی كوڕی شێخی بەهائەدین هاتووەو داوای ڕووخسەت دەكات كە بێت بۆ خزمەتی جەنابت منداڵەكە ووتی باشە دەڕۆم منیش هەندێك دراوی ئاسنم پێداو ڕۆشت.

پاش ماوەیەك گوێم لەدەنگی تەپڵ و دەف و زیكر بوو وەتادەهات ئەو دەنگە نزیكتر دەبویەوە بۆیە یەكسەر لە ماڵی پیرەژنەكە هاتمە دەرەوە، تەماشا دەكەم جەنابی شێخ عەلی تاڵەبانی و كۆمەڵێكی زۆر لە سادات و زانای ئاینی لەخزمەتیدا تەشریفیان هێناوە بۆ پێشوازیم عەرزم كرد جەنابت بۆ زەحمەتت كێشاو تەشریفت هێنا من خۆم دەهاتمە خزمەتت فەرمووی تۆ خاوەن مافێكی كە دەیانەوێت لێت زەوت بكەن وەمن ئەركی سەرشانمە بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە پیرۆزە بێم بەهاناتەوەو پشتیوانیت لێ بكەم، دواتر هەرچی هەوڵمدا كە جەنابیان سواری ئەسپەكە بن قەبوڵی نەكردو فەرمووی ئێستا ئێمە بەزیكرو تەپڵ و دەفەوە بەناو شاری كەركوكدا ڕێپێوان دەكەین دەبێت تۆ دیاربیت لەناو ئێمەدا تاوەكو دەسەڵاتدارانی كەركوك ئاگاداربن لەهۆكاری ڕێپێوانەكەمان، جەنابی شێخ عەلی تاڵەبانی شێوازی ڕێپێوانەكەی بەجۆرە ڕێكخستبوو سادات لە ڕیزی پێشەوە پاشان زانا ئاینیەكان و لەدواشەوە زیكری دەروێشەكان هەروەها من و جەنابیشیان لەناوەڕاستی زیكرەكەدا بووین بەوشێوە بەرێكەوتین تاگەیشتینە ناو شاری كەركوك و بەردەم (دار الولایة)ی عوسمانی، لەوكاتەدا والی هاتە خزمەت جەنابی شێخ عەلی پاش سڵاوو زیارەت كردن عەرزی كرد قوربان ئەم قەرەباڵغی و زیكرە چیەو ئەو گەنجە كێیە؟

لەوەڵامیدا فەرمووی ئەوە شێخ عەلی كوڕی شێخی بەهائەدینە كە هەندێك بەشێتی

دەدەنە قەڵەم بەڵام ئەو هاتووە بۆ ئێرەو دەڵێت من شێت نیم تەنها داوای مافی خۆم دەکەم و بەسوڵتانی عوسمانی ڕادەگەیەنم کە لە بارەی جێگەداری شێخی بەهائەدینەوە بەپێچەوانەی شەرع بڕیارتداوەو (ئیرسی باوك بەکوڕ دەگات نەك بەبرا)[(١١)] وەتۆ لەسەر چ بنەمایەك حەقی باوکمت داوە بەبراکەی. هەر بەوهۆیەوە منیش ئەو بەشایانی جێگەداری باوکی دەزانم بۆیە پشتگیری لێدەکەم.

لەدوای تەواوبوونی فەرمایشتەکانی جەنابی شێخ عەلی تاڵەبانی، والی عەرزی کرد زۆر باشە ئێمەش پشتیوانی لەبڕیاری جەنابت دەکەین جالەبەرئەوە نووسراوێك لەم بارەیەوە ئامادەبکەن و واژووی بکەن تاوەکو لەڕێی والی بەغداوە بەڕێی بکەین بۆلای سوڵتانی عوسمانی. حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) فەرمووی پاشان لەخزمەتی شێخ عەلی تاڵەبانی ڕوخسەتم وەرگرت و گەڕامەوە بۆ تەوێڵەی مونەوەرە. هەفتەیەك بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی و هیچ باسێك لەوبارەیەوە نەبوو تاوەکو سەر لەبەیانی ڕۆژی جومعە، جەنابی شێخ عومەری مامم لەگەڵ هەندێك لە خەلیفەکاندا تەشریفی دەبرد بۆ مزگەوتی گەورەی تەوێڵە بۆ بەجێ گەیاندنی نوێژی جومعە لەوکاتەدا منیش بەتەنها لەدوای ئەوانەوە دەڕۆشتم، لەپاش تەواوبوونی سونەتی پێش جومعە ووتاربێژ وویستی ووتارەکەی بخوێنێتەوە لەوکاتەدا سەربازێکی عوسمانی ئامادەبوو لەناو مزگەوتەکەداو بە ووتاربێژەکەی ڕاگەیاند کەوا فەرمانی سوڵتانی عوسمانیم پێیە هەربۆیە دەبێت پێش ووتارەکەت ئەم فەرمانە بەئامادەبوان ڕابگەیەنیت، وەناوەڕۆکی ئەو فەرمانەش بەم شێوە بوو ((ئێمە بەهەڵەدا براین

---

(١١) هاوشێوەی ئەم فەرمایشتە گێڕانەوەی خەوی مەلا جەسیمی هەجیجیە (بەڕەحمەت بێت) کە لەکتێبی (کورتەیەك لە سراج الطالبین) لەلاپەڕە (١٤٠)دا بەدرێژی باسکراوە ........................ نووسەر.

لـەبارەی جێگـەداری شـێخ (محمـد بەهائـەدین)ی کـوڕی شـێخ (عوسمـان سـراجەدین)ی نەقشبەندی هەروەها لەبەرئەوەی ئیرسـی بـاوك بـەکوڕ دەگـات نـەك بـەبرا لـەڕووی شـەرع و عورفـەوە، بەوهۆیـەوە بڕیارمانـدا بـە پشـتیوانی کردنـی شـێخ عـەلی نەقشـبەندی وەکـو جێگـەداری شـێخ محمـد بەهائـەدینی نەقشـبەندی وەفـەرمانی ئـەو فـەرمانی سـوڵتانەو دوژمـنیشی دوژمـنی سوڵتانە والسلام)).

ئەو حەزرەتە فـەرمووی پـاش تـەواوبوونی نوێـژی جومعـە جـەنابی مـامم دەسـتبەجێ بەڕێکەوت بەرەو خانەقاو فەرمانیدا بەخەلیفەو موریدەکانی کە هەرچی کەلوپەل هەیە کۆی بکەنەوەو فەرمووی ئیدی ئێرە شوێنی ئێمە نیەو دەبێت بەجێی بهێڵین. منیش چووم خۆمدا بەسەر دەستیداو عەرزم کرد مامەگیان فەرمانی سوڵتان لەجێی خۆی بەڵام تۆ هەر مـامی گەورەی منیت لەبـەرخاتری خـودا بـەجێمان مەهێڵـە بائـاژاوە دروسـت نـەبێت، لەوەڵامـدا فەرمووی نەخێر کاکە عەلی گیان مـن دژایـەتی فـەرمانی سـوڵتانم پـێ ناکرێـت هـەروەها خۆت دەزانیت هەندێك لەوخەلیفانە ڕێز بۆتۆ دانانێن ئەگـەر لێـرە بمێنینـەوە ئەوانـە دەبنـە کێشە بۆ مـن وتۆو خۆیـان لەبەرئـەوە واباشـترە لێـرە بـڕۆم و ئەوانـەش لەگـەڵ خۆمـدا ببـەم وەتۆش لەشەڕیان ڕزگار دەبیت. پاشان کـە مـامم تەشـریفی بـرد بـۆ بەغـدا مـن و دایکـم بەتەنها ماینەوەو لەوهەموو کەلوپەلانەی خانەقاش تەنها یەك مەنجەڵ و گلێمێکـی شـڕمان بۆمایەوە، ئەو کاتانەی کە من لەمەنجەڵەکەدا نانم دەخوارد دەبوایە دایکم دەستی لەخواردن هەڵگرتایەو بەپێچەوانەشەوە وەئەگـەر یـەکێکمان لەسـەر گلێمەکـە بخەوتایـە دەبوایـە ئـەوی دیکەمان لەسەر گـڵ بخەوتایـە. خەلیفـە ئەحمـەد فـەرمووی بـاوکم بـۆی گێڕامـەوە کـە ئـەو حەزرەتە لەکۆتایی فەرمایشتەکانیدا فەرمووی خـودای تعـالی منـی لـەو بـێ دەسـەڵاتی و نەبوونیەوە گەیاندوەتە ئەم دەسەڵات و پلـەو پایەیـە کـە خەزێنـەکانی حـەزرەتی سـولەیمانی

(علی نبینا وعلیه السلام) پیێ بەخشیوم وەشوکر بۆ خودا لە هیچم کەم نیە هەربۆیە هەمیشە ئەوە لەمێشك و دڵ و یادمدایە کە چۆن خودای مەزن لەو بێ دەسەڵاتی و هەژاریەوە گەیاندومیەتی بەم ڕۆژەو دەسەڵات و سامانێکی بێ ئەندازەی پێداوم ئاوەهاش دەتوانێت وەکو پێشتر هەژارم بکاتەوە جالەبەرئەوە هەرکات بمەوێت لە نیعمەتەکانی سوود وەرگرم هەوڵدەدەم زیادەڕەوی وئیسرافی تێدا نەکەم.

## وێنەی ژمارە: (٢)



(خەلیفە محمد تەوفیقی حسامی (بەڕەحمەت بێت))

بەم ڕیوایەتەی مەرحومی خەلیفە محمد تەوفیق ڕاستی ئەو بەسەرهات و ڕووداوەمان لەگەڵ هەڵوێستی جەنابی شێخ عەلی تاڵەبانی (قدس سره) لەو ململانێیەدا ڕوون کردەوە. هەروەها بەهۆی ئەو پشتیوانیەی جەنابی شێخ عەلی بۆ حەزرەتی حسامەدین (قدس سرهما)، وەکو پاداشتی وەفاو چاکە ( ئەوەبوو لەپاش وەفاتی جەنابی شێخ عەلی ئەو حەزرەتە تەشریف دەبات بۆ کەرکوك بەمەبەستی بەشداری کردن لەمەراسیمی سەرەخۆشیدا وەناگەڕێتەوە هەتاوەکو ئەوکاتەی کە جێگەداری جەنابییان دیاری دەکرێت ئەویش مەرحومی شێخ جەمیلی کوڕی جەنابی شێخ عەلی تاڵەبانیە (قدس سرهما) کە لەوکاتەدا کارمەندی حکومی دەبێت وەدەسەڵاتی ئەوکاتە ڕێگای پێ نادەن بگەڕێتەوەو لەجێگای باوکیدا ئیرشاد بکات بەوهۆیەوە حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) تەشریف دەبات بۆ بەغداو پاش هەوڵ و کۆششێکی زۆر حکومەتی ئەوکاتە ڕازی دەکات بەوکارەو جەنابی شێخ جەمیل دەگەڕێتەوە بۆ تەکیەی تاڵەبانی لەشاری کەرکوك وەلەجێگەی باوکیدا دەست بەکاردەبێت لەئیرشادکردن و بەڕێوەبردنی تەریقەتی تاڵەبانی قادریدا).

## ( حەزرەتی حسامەدین (قدس سرە) چ کەسێکی بۆ جێگەداری خۆی دیاری کرد )

زۆر دەستەو گروپ لەناو پەیڕەوانی ڕێبازی نەقشبەندیدا بوونیان هەیە کە لەبارەی جێگەداری ئەو حەزرەتەوە بۆ خۆیان ووتەو بیروباوەڕیان دروست کردوەو بەناو خەڵکدا بڵاویان کردوەتەوە بەڵام لە ڕاستیدا بەڵگەنامەو شاهیدە دادپەروەرەکان پێچەوانەی ئەو ووتەو هەڵبەستراوانە دەسەلمێنن هەربۆیە پێش خستنە ڕووی ووتەی شاهیدەکان وئاشکرا کردنی ئەو بەڵگەنامانە بەشیاوی دەزانم کە بەکورتی باسی قسەو خەیاڵاتی ئەو دەستەیە بکەم لەوبارەیەوە بۆئەوەی خوێنەری بەڕێز زیاتر شارەزاو ئاگاداربێت لەم باسەماندا.

بەبڕوای ئەو تاقمە حەزرەتی حسامەدین (قدس سرە) زیاد لەیەك جێگەداری دیاری کردوە بۆ خۆی لەناو ئەولادەکانیدا ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە مەحەبەتێکی زۆری نواندوە بەرامبەریان وەلوتفی باوکیەتی بوەتە هۆی ئەوەی کە گوایە لەیەك کوڕ زیاتری بەجێگەدار دەست نیشان کردبێت. بەڵام ئەو بیروباوەڕە پوچەو هیچ بنەمایەکی نیەو لەتەریقەتدا جێگای نابێتەوە بەڵکو ئەو حەزرەتە تەنها یەك کەسی لەئەولادەکانی بەجێگەداری خۆی داناوە کە ئەویش توانیویەتی مەرجەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لەخۆیدا جێبەجێ بکات، بەڵگەش بۆ ئەم ووتەیە گێڕانەوەی جەنابی مامۆستا مەلا عەلی کاتبی جوانڕۆییە (خودا بیپارێزێت) کە لەسەردەمی حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سرە) حزوری هەبووەو لەوکاتەدا لەخانەقای خورماڵ فەقێ بووە لە خزمەت ئەو مودەڕیسانەی کە موریدی ئەو حەزرەتە بوون وەتەمەنی لە دەوروپشتی سی ساڵیدا بووە هەروەها ئەو مامۆستا بەڕێزە لەکاتی سەرەمەرگی حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سرە) ئامادە بووەو شاهیدی وەسیەت و فەرمایشتەکانی بووە، لێرەدا بەهۆی درێژە پێنەدان تەنها ئەو بەشەی وەسیەتەکە دەخەینەڕوو کە پەیوەندی بەجێگداری ئەوحەزرەتەوە هەیە:

**ماموٚستا مەلاعەلی فەرمووی حەزرەتی حسامەدین** (قدس سرە) **چەند ساتێك پێش وەفاتی ڕووی موبارەکی کردە حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەمی کوڕی و**(قدس سرە) **فەرمووی ((محمد ڕۆڵە من منداڵ بووم کاتێك حەزرەتی بەهائەدینی باوکم وەفاتی کرد من خادمی خۆمم بە ڕووی سپیەوە جێبەجێ کرد، تۆ کوڕی گەورەی منیت و جێگەدارمیت هیوادارم ئەم قسەیەم لەبیر نەکەیت))[(١٢)].**

**ئەم وەسیەتە ناڕاستی خەیاڵی کرچ وکاڵ و بێ بنەمای ئەو تاقمە دەخاتە ڕوو کە لەسەرەوە باسمان کرد وەئەگەر بەوردی سەرنجی ئەم وەسیەتە بدەین بەڕوونی ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت کە حەزرەتی حسامەدین** (قدس سرە) **ڕاستەوخۆو بێ پەردە جێگەدار بۆ خۆی دیاری دەکات کە ئەویش شێخ محمد بەهائەدینی دووهەمە** (قدس سرە).

---

[(١٢)] **ئەم ڕیوایەتە لە گرتەیەکی ڤیدیۆیی خودی ئەو ماموٚستا بەڕێزە وەرگیراوە کە لە (فەیسبووك) پەیجی (سۆفیەکانی گەرمیان)دا بوونی هەیە ...................... نووسەر.**

## وێنەی ژمارە: (٣)



لەلای ڕاستەوە:

١ـ حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم (قدس سره).

٢ـ حەزرەتی شێخی حسامەدین (قدس سره).

مورشیدو سەرپەرشتی ئەو ڕێبازە پیرۆزە هاوشێوەی پاشایەتی و حوکمی ئاغایەتی نیە ئەگەر کوڕەکانیان شیاوی جێگەکەیان بوبن یان نا تەنها ئەوەندەی زۆردارو ستەمکار بوونایە بەس بوو بۆ ئەوەی ببن بەجێگەداریان وەئیتر حوکمی وولات و شارو گوندەکان لەژێر دەستیاندابێت، وەك ئەوەی کە لەبۆچون و خەیالاتی ئەو تاقمەی کە پێشتر باسمان کرد بەڕوونی دەردەکەوێت. بەڵکو مورشیدو سەرپەرشتی تەریقەت خزمەت و خادمیە بۆ ئەو ڕێبازەو پەیڕەوانی بەتایبەتی و مرۆڤەکانی دیکە بەگشتی.

هەروەها سونەتی خودای مەزن بەرامبەر بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و پیاوچاکان لەدێر زەمانەوە بەوشێوە بووە کە ئەگەر ئەولادی صالح و شیاویان هەبووبێت ئەوا خودا ئەوانەی هەڵبژاردوە بەجێگەداریان ئەوەش لەبەر هەڵسوکەوت و کاریگەری مەعنەوی ڕاستەوخۆی ئەو پێغەمبەرو پیاوچاکانە لەسەریان و بوونی تەجروبەو زانیاری ئەولادەکانیان لەو ڕێبازە پیرۆزەدا. هەربۆیە حەزرەتی حسامەدین ویستویەتی ئەو سونەتە جێبەجێ بکات هەروەها ئاواتی ئەوەبووە کە هاوشێوەی ئەولیاکانی پێش خۆی ئەو خەیرو پاداشتە قیامەتیە هەمیشەیی بێت و سەربەرزو ڕووسپی حزوری خوداو پێغەمبەرو (صلی الله علیەوسلم) ئەولیاکان بێت بەهۆی بەردەوامی ئەو (خادمیە)وە ئەویش بەدیاری کردنی شیاوترین کەس بۆ جێگەکەی کە حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەمە (قدس سره)، بەپشت بەستن بەو فەرموودەیەی حەزرەتی محمد (صلی الله علیەوسلم) کە ئەمە واتاکەیەتی بەکورتی ((ئەگەر ئادەمیزاد لەدونیا دەرچوو کارەکانی لەدونیا دەوەستێت بێجگەلە سێ کردەوە نەبێت کە یەکێك لەوانە ئەولادی صالحە کە بەردەوام لەدوای خۆی خەیرو پاداشتی

پێدەگات بەهۆی چاکەکاری وتاعەت وعیبادەتەکانیەوە) * .

حەزرەتی حسامەدین (قدس سرہ) بێجگەلەم وەسیەتەی کە مامۆستای پایە بەرز جەنابی مەلاعەلی کاتب ڕیوایەتی کردوە هیچ جۆرە وەسیەتێکی دیکەی لەبارەی جێگەداری کەسانی دیکەوە نەکردوە وەلەوبارەیەوە هیچ نووسراوێکیش لەو حەزرەتەوە بەجێ نەماوە کە مۆرو واژووی خودی خۆی پێوەبێت و ڕاستەوخۆ باس لەجێگەداریان بکات. وەئەو بەڵگەنامەی کە بەدەستەوەیەو لەم کتێبەدا خستومانەتە ڕوو بەهیچ شێوەیەك بەئاشکرا باسی جێگەداریی ئەو حەزرەتە ناکات هەرچەندە لەو بەڵگەنامەیەدا هەموو ئەو بۆچوون و بیروباوەڕە پوچانە بەدرۆ دەخاتەوە کە دەڵێن ئەو حەزرەتە موریدو مەنسوبەکانی ناوچەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوری بەسەر هەریەکە لەئەولادەکانیدا دابەش کردوەو بۆ هەر ناوچەیەك جێگەدارێکی بۆخۆی دیاری کردوە بەڵکو بەپێچەوانەی ئەو پڕوپاگەندە پووچانەیشەوە ئەوە دەسەلێنێت کە سەرپەرشتی هەموو خانەقاو مەوقوفاتەکانی تەنها بۆ یەکێك لەئەولادەکانی دەبێت کە ئەویش حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەمە (قدس سرہ) وەئەم بەڵگەنامەیەش بۆخۆی ئاماژەیە بۆ جێگەداری ئەو حەزرەتە لەلایەن حەزرەتی حسامەدینەوە (قدس سرہ). وەئەمەش وێنەی دەقە فارسیەکەی ئەو بەڵگەنامەیە:

---

* أخرجه ابن حبان في (صحيحه) (١٣|٢٧)، وابن حزيمة في (صحيحه) (٩|١٣٢)، والترمذي في (سننه) (٥|٣٨٩)، والنسائي في (سننه) (١٢|١)، والدارمي في (سننه) (١|١٤٨)، وابن عساكر في (معجم) (١|٢٥٨).

## نامەی ژمارە: (١)

بعد الحمد و الصلاة

موجب تحریر این سطور و ترتیب این مسطور آنکه فقیر بی نشان محمد علی مشهور به حسام الدین فرزند مرحوم حضرت بهاء الدین اعلی الله مقامه

که بر عموم خانقاههای طریقت و به [illegible] و سایر خانقاهها و موقوفات بر آنها سمت [illegible] و تولیت دارم ، از

این تاریخ فرزند ارشد خود محمد را تولیت دادم که مستقلاً اختیار عموم موقوفات این خانقاهها در دست وی بوده و اختیار

داشته باشد که در صورت لزوم برای هر کدام بخواهد وکیل بگیرد ، و نصب و عزل وکیل در دست خود اوست .

علیهذا به طریق عموم منصوبین و وابستگان این خاندان می رسانم که بعدها تولیت همه [illegible] و موقوفات به فرزندی محمد داده [illegible]

خواه در حین حیات و خواه بعد از مرگ من ترک و [illegible] در میان باشد . و صلی الله تعالی علی سیدنا

و مولانا محمد و علی آله و اصحابه و سلم اجمعین و آخر دعوانا ان الحمد

لله رب العالمین . بتاریخ ذیحجة الحرام سنة ١٣٥٥ قمری

(وەکالەت نامەی حەزرەتی حسامەدین بۆ حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم (قدس سرهما))

**ئەمەش دەقی کوردی ئەو وەکالەت نامەیەی سەرەوەیە کە حەزرەتی حسامەدین** (قدس سره) **بۆ حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەمی نووسیوە:**

**((بەناوی خودای مەزن))**

**(پاش شوکرو سوپاسی خودای تعالی و سەڵاوات لەسەر پێغەمبەرەکەی)**

**هۆی نووسین وئامادەکردنی ئەم نووسراوو دێڕانە ئەوەیە کە هەژاری بێ ناونیشان (محمدعلی) مەشهور بە (حسام الدین) کوڕی خوا لێخۆشبوو حەزرەتی (بەهائەدین)** (أعلی الله مقامه) **کە سەرپەرشتی وسەروکاری هەمەوو خانەقاکانی (تەوێڵەو باخەکۆن وسابڵاغ وخانەقاکانی دیکەو هەمەوو ئەو موڵك ومالانەی کە وەقفی ئەو خانەقایانە کراون) لەئەستۆی مندایەو خراونەتە ژێر دەسەڵاتم.لەم بەروارەوە کوڕی پێگەیشتووی خۆمم کەناوی (محمد)ە کرد بە سەرپەرشت وموتەوەلی بەسەر ئەو خانەقاو موقوفاتانەوە وەلەمەولا لەژێر دەسەڵاتی ئەودان وەهەرکات بەپێویستی زانی دەتوانێت بۆ هەریەك لەو خانەقاو مەوقوفاتانە وەکیل دابنێت، هەروەها دانان ولابردنی وەکیل لە دەستی خودی خۆیدایە، بەم شێوەیە بەهەمەوو شوێنکەوتوانی ڕێبازەکەم و کەسوکاری ئەم بنەماڵەیە ڕادەگەیەنم کەوا دواتر سەرپەرشتی هەمەوو ئەو موڵکانەی وەقف کراون یا پێشکەش کراون بۆ خانەقا بە (محمدی) کوڕم سپێردراوە چ لەئێستاداو چ لەپاش مەرگم ئەو سەرپەرشت و بەرپرسیاری ئەم کارەیە.**

**وصلی الله تعالی علی سیدنا ومولانا محمد وعلی آله وأصحابه وسلم أجمعین**

**وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین.**

بەروار: ذی الحجة الحرام ساڵی (١٣٥٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٩٢٤)ی زاینی

جێگەی مۆرو واژووی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره)

لەم وەکالەت نامەیەدا ناوی خانەقاو مەوقوفاتی شاری سابلاغ هاتووە کە شارێکە لەپارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوای ئێران وەلەو سەردەمەدا بە (ساوج بلاغ) ناوبراوە، کە زۆرجار لەلایەن سەربازەکانی عوسمانیەوە داگیرکراوە بەڵام دواتر بوویەوە بەموڵکی ئێران و بەشارێکی ئێرانی ئەژمار دەکرێت.

تاکە بەڵگەیەك کە چەواشەکاران بەدەستیانەوەیە ئەوەیە کە دەڵێن حەزرەتی سراجەدین (قدس سره) دوو لەکوڕەکانی بەجێگەداری خۆی دیاری کردووە ئەوانیش (حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی یەکەم و حاجی شێخ عبدالرحمن ناسراو بە "ابوالوفاء") (قدس سرهما) ئەمەش بەوبەڵگە نامانەی کە لە هەردوو کتێبی (ریاض المشتاقین)[١٣] و (بارقات السرور)دا[١٤] نووسراون و خراونەتە ڕوو وەلەم بارەیەوە دەپرسن ئایا ئیتر بۆچی دروست نیە کە ئەولیاو پیاوچاکان چەند کوڕێکیان ببنە جێگەداریان واتە فرە جێگەداری لەیەك کاتدا؟

لەوەڵامدا دەڵێین هەرچەندە ئەوکارە لە غەیری حەزرەتی سراجەدین (قدس سره) نەبیستراوە کە ئەولیاکانی دیکە ئەنجامیان دابێت بەڵام کاری ئەولیای خودا بێ حیکمەت نیە، یەکێك لە هۆکاری دانانی دوو جێگەدار لەلایەن ئەو حەزرەتەوە ئەوەبووە کە حەزرەتی شێخ عبدالرحمن ابوالوفاء (قدس سره) بێجگەلەوەی ئەولیاو عارفێکی مەزن و بەتوانابووە وەقوتبی زەمانی خۆی بووە لەگەڵ ئەوەشدا دایکی بەڕێزی برازای مورشیدو ئوستادی

---

[١٣] لە نووسینی جەنابی مامۆستا مەلا حامیدی کاتبی بێسارانی (بەڕەحمەت بێت) ........... نووسەر

[١٤] لە نووسینی جەنابی شێخ محمدی سمرانی (بەڕەحمەت بێت) ........................ نووسەر.

حەزرەتی سراجەدین بووە کـە دەکاتـە حـەزرەتی مـەولانا خالیـدی نەقشـبەندی (قـدس سـره)، وەلەڕاستیدا حەزرەتی مەولانا (قدس سره) هـیچ یـەك لـە ئـەولادەکانی نـەبوون بەجێگـەداری بەهۆی ئەوەی کە زۆربەیان بەنەخۆشی تاعون لە وولاّتی سوریا

پێش شەهید بوونی ئەوحەزرەتە بەهەفتەیەك شەهیدبوون، پاشان حـەزرەتی سـراجەدین (قدس سره) کە مـەزنترین خەلیفەکانی ئەو حەزرەتە بوو وەکو وەفادارییی و بەئەمـەکی بـۆ ئـەو هەمـوو لوتف و کۆششانەی مـورشـیدەکەی کـە بەرامبـەری ئـەنجامی دابـوو بڕیاریـدا شـێخ عبدالرحمن ابوالوفاء لەگەڵ حەزرەتی بەهائەدینـدا (قـدس سرهما) بەجێگـەدار دیـاری بکـات بەڵام بڕیاری خـودای تعـالی ئـەوەبوو کـە دەبوایـە لـە نـەوەی حـەزرەتی مـەولانا (قـدس سـره) مورشیدو جێگەدار هەڵنەکەوێت بۆیە پاش ماوەیەکی کەم لەوەفاتی حـەزرەتی سـراجەدین، شـێخ أبوالوفـاء(قـدس سرهما) لەشـاری بەغـداد کۆچـی دوایـی دەکـات، وەهەرلـەم بارەیـەوە حەزرەتی سراجەدین (قدس سره) خەلیفەو موریدەکانی ئاگادار کردوەتەوەو فەرموویەتی (مـن عـبدالرحمانی کوڕم بەجێگەداری خۆم دانا هەرچەندە دەزانم پاش خـۆم زۆر تەمـەن ناکـات و لـەدونیا دەردەچـێت). ئـەم ڕیوایەتـە لـەکتێبی (بارقـات السـرور)دا بـەم شـێوەیە باسـی لێوەکراوە. هەرلەم بارەیەوە پێشینانی کورد فەرموویانە:

خەرمان خەمەکەم وا لە کەلباوە

شەن کار یەکێکەو دوو شەن بەلاوە

لـەکۆتایی ئـەم بەشـەداو بـەکورتی ئـەوەی کـە مەبەسـتمان بـوو بەخوێنـەری بـەڕێز ڕابگەیەنین ئاشکرا کردن و خستنە ڕووی هەندێك ڕاستی شاراوە بوو لەبارەی ژیانی پـیرۆزی (حەزرەتی حسامەدین)ەوە (قدس سـره) بەتایبەت پێش کۆچی دوایی ئەو حەزرەتە کە لەلایـەن تاقمێکی بێباوەڕو دونیا پەرستەوە چەواشەکاری تێدا کرابوو وەهەوڵێکی زۆریان دابوو بۆ

بەهەڵە تێگەیاندنی باوەڕداران تاوەکو بگەن بەئامانجە ناڕەواکانیان.

هیـوادارین توانیبێتمـان بەباشـی بـاوەڕداران ئاگاداربکەینـەوە لـەم بابەتـەدا وەگـەرنا بەسـەرهات وخـەواریقی ئـەو حەزرەتـە بـێ ئەنـدازە زۆرەو لـەم نووسـراوە کورتـەدا جێگـەی نابێتەوە.

شایانی باسە حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لەساڵی (١٢٧٨)ی کۆچی بەرامبـەر بـە (١٨٥٧)ی زاینی لەگوندی تەوێڵە لەدایك بووەو شەش کوڕی هەبووە کە دوانیان لەتەمەنی منداڵیداو سێهەمیان لەتەمەنی لاویەتیدا لەحاڵی حەیاتی ئەو حەزرەتـەدا وەفاتیـان کـردوە ئەوانیش بەناوەکانی (شێخ محمد مەعسـوم)[١٥] و (شـێخ موعتەسـەم)[١٦] و(حـاجی شـێخ عوسمان)[١٧] (بەڕەحمەت بن). وەئەو کوڕانەی کە لـەپاش وەفـاتی لەژیانـدا مـابوون بـریتین لـە (حەزرەتی شێخ محمد بەهائـەدین (قـدس سـره) کـوڕی دووهـەم و جێگـەداری ئـەو حەزرەتـە)و (جەنابی شێخ موعتەسەم (بەڕەحمەت بێت) کـوڕی پێنجـەمی ئـەو حەزرەتـە)و (جـەنابی شـێخ ڕاغب (بەڕەحمەت بێت) کوڕی شەشەمی ئەوحەزرەتە).

هەروەها دایکی بەڕێزی حەزرەتی حسامەدین (قـدس سـره) نـاوی سـەید زادە (تەیبـە)ی کچی شێخ عبدالرحمان کانی توویی نەوەی شـێخ محمـدی تەڕاتـەوەن بـووە کـە ڕەچـەڵەکیان دەگەڕێتەوە سەر مەلا ئەبوبەکری موسەنیفی چـۆڕێ و پـیر خـدری شـاهۆیی (خـودا لێیـان ڕازی بێت).

---

[١٥] کوڕی یەکەمی حەزرەتی حسامەدین بووە (قدس سره) ...................... نووسەر.

[١٦] کـوڕی چـوارەمی ئـەو حەزرەتـە بـووە پاشـان کـوڕێکی دیکـەی بـووە دووبـارە نـاوی ناوەتـەوە (موعتەسەم) .................. نووسەر.

[١٧] کوڕی سێهەمی ئەو حەزرەتە بووە ...................... نووسەر.

لێرەدا بەم بەیتە شیعرانەی (ناتیق) (بەڕەحمەت بێت) کۆتایی بەم بەشە دەهێنین کە لە وەسفی حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سره) دەفەرمووێت:

حەزرەتی حسامی دین بێ لەگەڵ ئەولیاهان قەرین بێ
جێگەداری بەهائەدین بێ باموڵکی دڵ بەغارەت با
ئەی پرتەوی سیراجی دین وەی مەهی ئاسمان و زەمین
لوتفت دەوای دڵی حەزین جەلات ژەنگی ڕۆح لائەبا
ناتیق وەسفی ئەو حەزرەتە کە مەخزەنی ڕیازەتە
بۆ کەسێ وەك تۆ زەحمەتە چونکە شاهنامەیەك ئەبا

❊ ❊ ❊

## وێنەی ژمارە: (٤)



(مەرقەدی پیرۆزی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره))

تێبینی: لەلایەن بەڕێز مام جەلالەوە سەرۆك كۆماری پێشووی عێراق وەلەسەر داوای جەنابی شێخ كەریم كوڕی حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) وەبە هەوڵ وكۆششی بەڕێز شێخ شازاد كوڕی جەنابیان فەرمانی دووبارە بنیات نانەوەی ئەم مەرقەدە پیرۆزە جێبەجێ كرا (خودا پاداشتیان بداتەوە).

## وێنەی ژمارە: (٥)



(جەنابی حاجی شێخ عوسمان کوڕی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره))

وێنەی ژمارە: (٦)



(جەنابی شێخ موعتەسەم کوڕی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره))

## وێنەی ژمارە: (٧)



(جەنابی شێخ ڕاغب کوڕی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره))

وێنەی ژمارە: (٨)



(حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم (قدس سره))

## ( هەندێك لە بەسەرهاتی ژیانی حەزرەتی
## شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) )

حەزرەتی شێخ محمد مولەقەب بە بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) کوڕی پێگەشتوو وەجێگەداری حەزرەتی حسامەدین نەقشبەندی (قدس سره) بووە ئەم زاتە لە شەوی هەینی بەرواری (٢٢)ی (ذي الحجة)ی ساڵی (١٣١٠)ی کۆچی بەرامبەر بەساڵی (١٨٨٩)ی زاینی لەگوندی تەوێڵەی سەر بە ناوچەی هەورامان لەدایك بووە، ناوی دایکی بەڕێزی حاجی پیرۆزی کچی یار ئەحمەد بەگ بووە، پاشان لەخزمەت شێخی باوکیداو زانا پایە بەرزەکانی ئەو سەردەمەدا زانستە ئاینی و مەعنەویەکانی خوێندووە هەروەها شارەزایی لەزمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکیدا هەبوەو بەزمانی فارسی و هەورامی وکوردی شیعری ووتوە.

حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) لەپاش وەفاتی شێخی باوکی مەشغوڵ دەبێت بەو ئەرکەی کەباوکی پێی سپاردبوو لە سەرپەرشتی کردنی خانەقاو مەوقوفاتەکان و خزمەت کردن بە موریدو مەنسوبەکانی ئەو ڕێبازە پیرۆزە هەرچەندە لەگەڵ ئەو بەرپرسیاریەتیە هەستیارەدا هەندێك بەربەست وکێشەی گەورە دەهاتنە ڕێی ئەو حەزرەتە بۆ پەکخستن و شکست هێنان بە ڕێبازی حەزرەتی حسامەدین بەڵام حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سرهما) بەدانایی و لێبوردەییە فراوانەکەیەوە کۆڵ نادات لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی خۆی وەبەگوێرەی ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەوسەردەمەدا بەسەر ناوچەکەدا سەپێنرابوون هەمیشە خزمەت و سەرپەرشتی خانەقاو موریدەکانی ڕۆژهەڵات و باشوورو باکوری کوردستانی کردووە.

شایانی باسە ئەو حەزرەتە زۆربەی کۆتاییەکانی ژیانی لەکوردستانی ڕۆژهەڵات بەسەر بردوە کە دواتر بە دوورو درێژی هۆکاری کۆچی ئەو حەزرەتە بـۆ کوردسـتانی ڕۆژهـەڵات و نیشتەجێ بوونی لەشاری سنەدا دەخەینە ڕوو.

## ( ڕیوایەتی ئەو کەسانەی کە شاهیدی ڕەوشتە بەرزو کەم وێنەکانی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) بوون )

وەکو لەپێشەکی ئەم کتێبەدا ئاماژەم پێدا کەوا بەهۆی نەگەیشتنم بەخزمەت حەزرەتی حسامەدین و بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) ئەوا لێرەدا تەنها پشت بەو ڕیوایەتانە دەبەستم کە بیستوومە لە حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامی (قدس سره)و هەندێك لەو شاهیدە زاناو عادلانە.

مەرحومی حاجی کاکە شێخی حسامی لە حاجی محمد ئەمینی کەڵاتێیەوە بۆی گێرامەوە کەوا جارێکیان لە خزمەت حەزرەتی حسامەدین‌دا (قدس سره) بووم هەندێك لە مەشایخی ناوچەکە هاتنە خزمەتی و پاش ماوەیەك عەرزیان کرد قوربان پێمان باشە ئەو کوڕانەی کە بۆ جێگەداری خۆمان دیاریمان کردون جەنابت لەگەڵ جێگەدارەکەی خۆتدا هەندێك پرسیاریان لەوبارەیەوە لێ بکەیت تاوەکو بۆمان دەربکەوێت کە چەندە شیاوی ئەو ئەرکو بەرپرسیاریەتیە مەزنەن، وەبۆیە ئێمە ئەم کارەمان خستوەتە ئەستۆی جەنابت چونکە هێزو توانای مەعنەوی و تەجروبەی دین و دنیاتان لە ئێمە زیاترەو پلەو پایەتان بەرزترە. ئەو حەزرەتەش لەوەڵامیاندا فەرمووی پێویست بەم کارە ناکات خودای مەزن لەکۆتاییدا ئاشکرای دەکات کەوا کام لەم جێگەدارانە شیاون بۆ ئەو شوێنە پیرۆزە، بەڵام ئەو مەشایخانە بەوەڵامی ئەو حەزرەتە قەناعەتیان نەکردو پێداگریەکی زۆریان کرد لەوبارەیەوە تائەوەی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) ڕازی بوو بەوەی کە لە هەریەك لەو ئەولادانە پرسیار بکات و لەوبارەیەوە پێیانی فەرموو: ئایا ئێوە دنیا دەکەن بەئامراز بۆ بەدەست هێنانی ڕازیبوونی خوداو خۆشبەختی دوارۆژی خۆتان وپەیڕەوانی تەریقەت یان بە پێچەوانەوە ئاین وتەریقەت دەکەن بەئامراز بۆ خۆشگوزەرانی خۆتان وبنەماڵەکەتان وەتەنها

ئاین و تەریقەت وەك ڕووكەشێك بۆئەو مەبەستە بەكاردەهێنن؟

هەریەكە لەجێگەداری مەشایخەكانی دیكە وەڵامی ئەو حەزرەتەیان دایەوە كە هەمووی یەك ئامانجی دەپێكا ئەویش بەم شێوەیە بوو كەوا (دینداری پێویستە بۆ مرۆڤ وەلەپاڵیدا خۆشگوزەرانی و سوود وەرگرتن لەدونیا ئاواتمانە). بەڵام كاتێك ئەو پرسیارەی لەحەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) كرد لەوەڵامدا فەرمووی (من هیچ گومانم لەوە نیە كەلەكۆتایدا دەگەڕێمەوە بۆ حزوری خودای مەزن، ئەگەر لەژیانمدا ئەركو بەرپرسیاریەتی خۆم بە ڕێكو پێكی ئەنجام نەدەم ئەوا بە چ ڕوویەكەوە لە دوارۆژدا وەڵام بدەمەوەو سەر بەرزبكەمەوە لەحزوریدا جالەبەرئەوە من پێم باشترە كە خۆشگوزەرانی خۆم پشتگوێ بخەم لەپێناو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خودای مەزن و سەركەوتنی دوارۆژدا).

حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) بەبیستنی ئەم وەڵامە زۆر شادمان بوو بەجۆرێك هەموومان هەستمان بەو خۆشحاڵیە كرد كە لە دەموچاوی پیرۆزیدا دەركەوت، هەروەها پێی فەرموو ئافەرین ڕۆڵەگیان هەرچەند هەڵبژاردنەكەت كارێكی یەجگار سەختە بەهۆی عەودالّ بوونی خەڵك بەگشتی بەشوێن خۆشی و سوود وەرگرتن لەماددەو لەزەتەكانی دونیا بۆ تێركردنی نەفس و جەستەیان وەزۆر بوونی ئەوانەی خولیای كۆكردنەوەی سەروەت و سامان و پلەو پایەی دنیاین هەروەها كەم بوونەوەی ئەوانەی كە تالبی ئەوجۆرە ڕێبازەن كە تۆ مەبەستە بیگریتەبەر بەڵام هیوادارم سەركەوتوو بیت لەم كارەتداو تاكۆتایی ژیان بەردەوام بیت لەسەری.

لەڕاستیدا دۆعاكەی ئەو حەزرەتە بۆ جێگەدارەكەی هاتەدی و خودای تعالی ئەو دۆعایانەی بەوشێوە قەبوڵ كرد بەجۆرێكی وەها كە لەهەندێك سەرچاوەی فەرمی حكومەتی پێشووی ئێراندا بەم شێوە لەبارەی ژیان وكەسایەتی حەزرەتی بەهائەدینی

دووهەمەوە (قدس سره) باسكراوە: (شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم كەسایەتیەكی ئاینی پاك بوو وەهەرگیز سەری شۆڕ نەكرد بۆ هیچ حیزب و دەسەڵاتێك و نەبوو بەژێر دەستەیان هەروەها گۆشەگیری ڕێبازی تەسەوف بوو).

ئەگەر ویستی خودای تعالی لەسەر ئەوەبێت كەسێك بگەیەنێتە پلەو پایەی مرۆڤی كامڵ لەلایەنی ئاین و خورەوشتی بەرزەوە ئەوا چەند ئامرازێكی مەعنەوی پێ دەبەخشێت و دەیكات بە سروشتی بۆ سوود گەیاندن بەمرۆڤەكانی دیكە ئەویش بەهۆی دیاربوونی لەناو خەڵكداو هێزی ڕاكێشانی دڵ و بیرو هۆشیان بۆ لای خۆی، هەر لەوبارەیەوە عاریفە مەزنەكانی فارس بەشیعرێك ئەم بابەتەیان ڕوون كردوەتەوەو فەرموویانە:

حكمت محض است اگر لطف جهان آفرین

خاص كند بنده مصلحت عام را

واتە: لەحیكمەتی پوختی خودای بەدیهێنەری جیهانە ئەگەر بەلوتفی خۆی یەكێك لەبەندەكانی تایبەت بكات بۆ بەرژەوەندی گشتی.

ئەگەر سەرنج بدەین ئەو كەسانەی كەوا خەڵكانێك خۆشیان وویستن و خۆیان بەشوێنكەوتویان لەقەڵەم دەدەن وەبەگەورەو بەرپرسی خۆیانیان دەزانن چ لەلایەنی كاروباری دونیاوە بێت یاخود ئاین و بیروباوەڕ ئەوە بەهۆی هەندێك سیفات و ڕەوشتی بەرزو گرنگەوە بووە كەلەو كەسە مەزن و پایە بەرزانەدا چەسپاوە بۆ بەڕێوەبردنی ئەركەكانیان، بۆ نموونە (جارێكیان هەندێك لەموریدو مەنسوبەكانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لەدەڤەری هەڵەبجە دەچنە خزمەت ئەو حەزرەتەو عەرزی دەكەن كەوا دڵگرانین لە حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی كوڕتان بەهۆی ئەوەی زۆر توڕەیە بەرامبەر بەئێمەو هیچ مەحەبەت و لوتفێك دەرنابڕێت لەڕوومانـدا ئەو حەزرەتەش لەوەڵامیاندا دەفەرمووێت

لەسەرخۆبن و پەلە مەکەن من دوو سیفەتم لـە محمـددا بـەدی کـردووە کـە زۆر مـەزنن وەلـە ڕەوشت و سیفاتی حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەر دەچن (علی نبینا وعلیه السلام) جالەبەرئەوە من ئومێـدێکی زۆرم پێیـەتی کـە ماوەیـەکی تـر ببێـت بـەمرۆڤێکی مـەزن ئـەو سـیفاتانەش ئەمانەن یەکەم: کاتێك نان و خواردنی بۆدێنن بەتەنها بۆی ناخورێـت و دەگـەڕێت بەشـوێن هاوەڵێکدا تالەگەڵیدا نان بخوات وەئەگەر کەسیشی دەست نەکەوێت، بێجگەلە دوژمنـەکەی دەعوەتی دەکات و ئەوکات خواردنەکەی پێ دەخورێت. دووهەم: یـەکێکی تـر لـەو ڕەوشـتە مەزنانەی ئەوەیە ئەگەر درۆزەکـار بێتـە بـەردەرگای ماڵەکـەی و داوای یارمـەتی لێ بکـات وەلەوکاتەدا هیچ شتومەك و پوڵ و پارەیەکی نەبێت ئەوا کەواکەی بەری خۆی دادەکەنێت و پێی دەبەخشێت).

زۆرێك لە هاووڵاتیـانی شـاری سـنە بۆیـان گێڕاومەتـەوە کـەوا حـەزرەتی شـێخ محمـد بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) چرایەك بوو بـۆ ڕۆح و دڵ و دەرونمـان کاتێـك کـە دەچـووینە خزمەتی سـودێکی زۆری مەعنـەویمان لێ وەردەگـرت بـەڵام قـەدرمان نـەزانی تائەوکاتـەی وەفـاتی کـردو بـە مەراسـیمێکی شـکۆداری بـێ ئەنـدازە قەرەباڵغـەوە تـەرمی پـیرۆزی لەشارەکەمان دەرچوو بەرەو گوندی تەوێڵـە ئـەوکات خـەڵکی سـنە کەوتنـە جـۆش وخـرۆش وگریـان بـۆ لەدەسـتدانی ئـەو زاتـە مەزنـە وەئەوکاتـە بۆمـان دەرکـەوت کـە چ کەسـێکی بەبەرەکەت وگەورەمان لەدەستداوە.

حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامی (قدس سره) بـۆی گێڕامـەوەو فـەرمووی خـودای تعـالی بەهرەیـەکی زۆری بەخشـیبوو بەحـەزرەتی بەهائـەدینی دووهـەم (قـدس سـره) لەوانـە دەسـتوخەتێکی زۆر جـوانی هـەبوو وەلـەوە گـرنگتر دەیتـوانی لەپشـتیەوە قەڵـەم بگرێـت بەدەستیەوەو زۆر بـەجوانی لەسـەر کاغـەز بنوسـێت بـەبێ ئـەوەی خـۆی تەماشـای بکـات.

هەروەها فەرمووی جارێکیان هەواڵیان هێنا بۆ ئەو حەزرەتە کەوا کۆمەڵێك بیانی خەڵکی بەریتانیا هاتونەتە خورماڵ و هەندێك کاری سەر سوڕهێنەر دەکەن ئەو حەزرەتەش بەمنی فەرموو ڕۆڵە باپێکەوە بڕۆین تەماشایان بکەین تاوەکو بزانین ئەوانە کێن و چ کارێك ئەنجام دەدەن، لەخزمەتیدا ڕۆشتین بۆ شارۆچکەی خورماڵ پاش گەیشتنمان بەو کۆمەڵە بەریتانیە، یکێکیان چووە سەر کەڵەکێکی بەرزو خۆی خستە خوارەوە بەبێ ئەوەی لە غەیری قاچی هیچ شوێنێکی دیکەی بکەوێتە سەر زەوی، ئەو حەزرەتەش بەوکەسەی فەرموو ئەو کارەی تۆ زۆر

ئاسانە من دەتوانم لەوە زیاتر ئەنجام بدەم لەوکاتەدا خۆی هەڵداو چووە سەر کەڵەکەکەو بەهەمان شێوە خۆی هەڵدایە خوارەوە بەبێ ئەوەی هیچ شوێنێکی لەغەیری قاچی بەرزەوی بکەوێت وەبەم کارە هەموو ئامادەبوان سەریان سوڕما.

پاشان ئەو حەزرەتە فەرمووی چ کارێکی سەر سوڕهێنەری دیکەتان لەدەست دێت پیشانمان بدەن؟ لەوکاتەدا کەسێکی دیکەیان تفەنگێکی هێناو بەپێوە تەقەی لەچەند پۆڕێك کرد کە بەئاسمانەوە دەفڕین و پۆڕێکی لێ خستنە خوارەوە، پاشان حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) فەرمووی ئەسپێکم بۆ ئامادەکەن سواری ئەسپەکە بوو وەبۆ ماوەیەك بەغار دەهاتوو دەچوو دواتر هەرلەو حاڵەتەدا بە تفەنگەکە تەقەی لەچەند پۆڕێك کردو پۆڕێکی لێ خستنە خوارەوە.

لە شێخ سەیفواللّەی دیاربەکریم بیست کەیەکێك بوو لە موجازەکانی سەید قەدری هاشمی[(١٨)] (بەڕەحمەت بێت) بۆ سەرخەتمەی شاری دیاربەکر فەرمووی ئەوکاتەی کە حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) لەشاری سنە نیشتەجێ بوو لەخزمەت سەید نەسیمی کوڕی

---

(١٨) خەلیفەی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) بووە لە وڵاتی تورکیادا ...................... نووسەر.

سەید قەدریدا (بەڕەحمەت بن) چووین بۆ خزمەتی ئەو حەزرەتە بەمەبەستی وەرگرتنی خەلافەت نامەو دەستنیشان کردنی سەید نەسیم بەجێگەداری سەید قەدری (بەڕەحمەت بن) لەلایەن ئەو حەزرەتەوە، بۆ یەکەمجار بوو کە دەگەیشتمە خزمەتی لەوکاتەدا بەتورکی قسەی لەگەڵ کردین وەزۆر بەباشی لەزمانی تورکی شارەزا بوو بەشێوەیەك کەوات دەزانی خەڵکی شاری ئیستەمبوڵە.

شێخ سەیفوالله ئەوەشی بۆ گێڕامەوەو فەرمووی لەو ماوەیەی کە لە خزمەت ئەو حەزرەتەدا بووین عەرزیم کرد ئایا ئێمە دەتوانین ڕابیتەی مەعنەوی جەنابت بکەین وەئایا گەشتونەتە پلەی مورشیدی کامیل وموکەمەل؟ لەوەڵامدا فەرمووی بەڵێ گەیشتومەتە پلەی ئیرشادی موتڵەق وەدەتوانم سوودی مەعنەوی بگەیەنم بەڕۆحی موریدەکان بەڵام لەبەر ئەدەب و وەفا بۆ حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) ڕێگە بەخۆم نادەم کە ڕابیتەم بکەن[19].

---

[19] ئەم سیفەت و سروشتە زۆر دیار بووە لە حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم و حەزرەتی شێخ ئەحمەدی جێگەداریدا (قدس سرهما) ....................... نووسەر.

## وێنەی ژمارە: (٩)



ئەو کەسانەی دانیشتوون لەلای ڕاستەوە:

١. شێخ سەیفوالله دیاربەکری

٢. حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره)

٣. شێخ نەسیم هاشمی (بەڕەحمەت بێت)

ئەو کەسانەی بەپێوە وەستاون لەلای ڕاستەوە:

١. شێخ فاروق کوڕی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم

٢. شێخ کەمال کوڕی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم

٣. شێخ مستەفا کوڕی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم

حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) بێجگەلەوەی کە مورشیدێکی مەزن و خاوەن چەندەها خوڕەوشتی بەرزو بەبەها بووە لە عیلم و مەعریفەو شیعر وتنیشدا دەستێکی باڵای هەبووە،

هەربۆیە لێرەدا دوو نموونەی شیعری ئەو حەزرەتە دەخەینە ڕوو یەکەمیان غەزەلێکە بە زمانی کوردی کە بۆ حەزرەتی حسامەدینی (قدس سره) نووسیوە کاتێك کە تەشریفی لە ئەفغانستان بووە بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکێك کە ئەو حەزرەتە پێی سپاردبوو وەبەهۆی مانەوەی زۆری لەو وڵاتەدا یادی دووری ئەو حەزرەتە دەکات و ئەم شیعرانە دەنێرێتە خزمەتی:

سەبا ئەمڕۆ بڕۆ بۆ خزمەتی سوڵتانی خوبانم

بکە عەرزی قەدەم بوسی و بەیانکە دەردی هیجرانم

بڵێ عەرزی ئەکردی ئەو جگەر سووتاوی بێ چارە

ئەوا دەردم گرانە ئەی تەبیب هاوارە دەرمانم

شەوو ڕۆژ ناڵە ناڵی من لەکورسی وعەرشی ئەعلادا

تەزەلزول کەوتە سەر لەوح و قەڵەم گریا لەگریانم

عیلاجی دەردی بێ دەرمان وگریان وفوغانی من

یەقین یا مەرگە یا دیدارە یا پابووسە ئەیزانم

شەکەر خۆرم وەکو تووتی دەناڵێنم وەکو قومری

لەدووری فیرقەتت قوربان وەکو بولبول غەزەل خانم

لەبێ لوتفی ئەتۆ قوربان من و دەرماڵی لوتفی حەق

بەڵێ هەرئەو خەبەردارە کە من چەند دڵ پەرێشانم

لە دارولحوزنی بەدبەختی وەها بەختم لە دەورایە

شـەوو ڕۆژ جـارییە ئەشـکم لەبــەر ناسۆری زامــانم

ئەزانم چارەی دەردم عـیلاجی فیرقەتم قوربان

زیـارەت کـردنـی خاکی دەری کـۆی جـانی جـانانم

سروری مـن حوزوری تۆیە ئەمما زاهیرو باتین

قوسوری مـن لەدووریتـە شکانــدی عەقـڵ وئیمـانم

لەئەشکی سورو ڕەنگی زەردی مـن ڕەنگینە ئەوزاعـم

وەکو قەوس وقەزەح گوڵگوون وەکـو تاوسی باخــانم

نە دڵمەندم نە خورسەندم نە باکارم نە بێکارم

ئەمـن وەك شەمسی تـەبریزی نـە ناشادم نـە شادانم

نە سالارم نە سەردارم نە ئەوتادم نە ئەبرارم

نە چون مەجنون دڵ ئەوگارم نەساحیب سەر نەسامـانم

فەقیرم گۆشەگیرم شاهم و شازادەی دەوران

گوتم خارم خـەسم نوری قەمــەر شـــەمعی شەبستانم

غـەزالم نەونەهالم عاشقم عوشاقی عەهدی تۆ

لەسایــەی ئیلتیـفاتی تۆیـە ئـەوەڵ مــەردی مــەیدانم

ئەوا هات بەفرو سەرما دای بەسەرما خاك بەسەر سەرما

مەگـەر نازانی گەرمـای لوتفـی تـۆم بیٚ نـورە نیرانم

محمد ماتەمە بێچارە دڵ ئەوگارە غـەیری تۆ

ئومێدم هیچ نیە ئەسڵا وەها سەرمـەست و حەیـرانم

(لــەوەڵامی ئــەم شــیعرانەیدا حــەزرەتی (حســامەدین)یش (قــدس ســره) ئــەم بەیتانــەی بــۆ دەنووسێت):

مەگەر نازانی شوعلەی مانگ لە قووەی پەرتەوی ڕۆژە
ئەتـۆ مـاهی منی بـۆ تـۆ ئەمـن خـورشیدی تـابـانم
ئیتر ناڵە و فوغانی بۆچیە بۆچی دەناڵێنی
عیلاجی دەردی هیجران وەسڵە بۆ مەجنونی دەورانم
لەسایەی لوتفی پیرانۆ بەشەرتێ خۆت بناسی تۆ
شکۆفەو گوڵبوونی شاهانی ئــەی شەمعی شەبستانم
شەهو سەردارو سەروەر ڕێزە خۆری خوانی مەولاتن
ئیتـر باکـت دەبێ چـی بێت لە شـای ئێران و تـورانم
لەباتی ساغەری گوڵگون پیاڵەی چای عەقیقی ڕەنگ
تـەناولکە بـەکەیفی خـۆت بەیـادی لـەعلی ڕومـانم

* * *

ئەو سەردەمەی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) لەشاری سنە دەژیا بەیتێکی فارسی نووسیبوو کە هەندێك لە موریدەکانی ئەو حەزرەتە بۆیان گێڕامەوە کەوا زۆرجار ئەو شیعرەی دەوتەوە هەروەها لەناو کتێبێکی ئەو حەزرەتەدا لەسەر پارچە کاغەزیك بە دەستوخەتی پیرۆزی خۆی ئەو شیعرەی نووسیبوو کە ئێستا بەندە لەخزمەت ئەو کتێبەدام بەناوی (حياة الحيوان). ئەو بەیتە فارسیەش ئەمەی لای خوارەوەیە کە دەفەرمووێت:

مدعی خواست که از بیخ کند ریشه ما

غافل از آنکه خدا هست در اندیشه ما

واتە: ئەو کەسەی کە ئیدیعای ململانێی دژ بەئێمە دەکرد وویستی بەڕەگو ڕیشەوە بنە بڕمان بکات بەڵام بێ ئاگابوو لەوەی خودا لەدڵ و دەروونی ئێمەدایەو دەمانپارێزێت.

مەرحومی حاجی کاکە شێخی حسامی کە خەلیفەی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بوو هەروەها مامۆستای زمانی فارسی بەندەش بوو، بۆی گێڕامەوەو فەرمووی لەگەڵ حەزرەتی بەهائەدینی دووهەمدا (قدس سره) دراوسێ بووین جارجارە دەچووینە خزمەتی بۆ کەسبی فەیزو بەرەکەت لە ڕاستیدا ئەو حەزرەتە زۆر ڕەوشت بەرزو بەئەدەب و لەسەرخۆ بوو وەیەکێك لەهەرە سیفاتە دیارو دەگمەنەکان کە لەو حەزرەتەدا هەمیشە بەدی دەکرا ئەوەبوو لەناو کۆڕو مەجلیسەکانیدا بەکەمی فەرمایشتی دەکرد بەڵام ئەو فەرمایشتانەی ئەوەندە پڕ واتاو نەستەق بوون کاتێك کە فەرمایشتی دەفەرموو بەجارێك هەموو ئامادەبوان سەریان سوڕدەماو بێدەنگ دەبوون لەبەر گرنگی فەرمایشتەکانی.

هەروەها ئەمەشی بۆ گێڕامەوەو فەرمووی ئەو حەزرەتە زۆر حەزی لەخواردنی کوردەواری دەکرد بەتایبەت دۆینەو ترخێنە، هەندێك جار کە لەماڵەوە دروستمان دەکرد قاپێکم دەبردە خزمەتی لەوکاتەدا دەیفەرموو دانیشە بەبێ تۆ پێم ناخورێت منیش ناچار

فەرمانەکـــەیم ئـــەنجام دەداو لـــە خزمـەتیـــدا دادەنیشـــتم لەڕاســـتیدا ئەوەنـــدە بـــەجوانی و بەلەسەرخۆیەوە ئەو خواردنەی مەیل دەکرد کـە لەگـەڵ خـواردنی هـەر کەوچـکە شـۆربایەك ئەوپەڕی شوکرو قەناعەت لە سیمای پیرۆزیدا دەردەکەوت.

## ( هۆكاری كۆچی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) بۆ ڕۆژهەڵاتی كوردستان )

وەك ئەوەی لە بەشی یەكەمدا ئاماژەمان پێدا لەسەردەمی حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سره) كەسانێك هەبوون كە دژایەتی ئاین و زاناو مورشیدە ئاینیەكانیان دەكرد بەگشتی و ئەهلی تەریقەت بەتایبەتی ئیتر ئەو دوژمنانە بەشێوەی دەستەو تاقم بووبێت یان تاكە شەخس هەمیشە دژایەتی و بەگژاچوونەوەی ئەو ڕێبازە پیرۆزە ئامانجیان بووە بەڵام بەهۆی لاوازبونیان و نەبوونی پشتیوانی بەهێزی دەرەكی و ناوخۆیەوە هەروەها فەرمان بەرداری كۆمەڵگەی ئەو سەردەمە بۆ ئەو ڕێبازە ئاینیانە هۆكاربوون بۆ ئەوەی كە ئەو دوژمنانە نەتوانن بەئاشكرا بچنەوە بەگژ ئاین و تەریقەتدا. بەڵام ئەو دۆخە زۆر درێژەی نەكێشاو چەند ساڵێك لەپاش كۆچی دوایی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) شۆڕشی عبدالكریم قاسم لەدژی حوكمی پادشایی دەستی پێكردو وردە وردە بیروباوەڕی كۆمۆنیستی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بڵاودەبویەوەو هەتا دەهات بەهێزتر دەبوو وەپەیدابوونی ئەم بیروباوەڕەش بووە هۆی لاوازبوونی ئاین و ڕێبازە مەعنەویەكان لەناو كۆمەڵگای كوردەواریدا.

لەو سەردەمەدا دوژمنانی ئەو ڕێبازە پیرۆزانە كە لەئەوپەڕی هێزدابوون توانیان بنە بەربەست بۆ كاروباری مورشیدو موریدو مەنسوبەكان هەروەها بەسەختی دژایەتیان دەكردن تائەو ئەندازەیەی كە هەوڵێكی زۆریان دەدا بۆئەوەی مورشیدە بەناوبانگەكانی تەریقەتی نەقشبەندی پاڵپشتی و لایەنگری بیروباوەڕی كۆمۆنیستی بكەن بەڵام لەوبوارەدا نەیانتوانی سەركەوتن بەدەست بهێنن هەربۆیە ناچار بوون بۆ ئەو مەبەستە ڕووبكەنە منداڵەكانیان وەلەم كارەیاندا تاڕادەیەكی كەم بەرەوپێش چوونیان بەدەست هێنا.

لەوكاتەدا ئەركو بەرپرسیاریەتی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) قورستر بوو

بەشـێوەیەك كـە هەنـدێك جـار بەحیكمـەت و خۆڕاگریـەوە ڕوبـەڕویان دەبوویـەوە چـونكە بێباوەڕیی و دووربونی ئەو دەستەیە لەهەموو بەها مرۆییەكان لـەبۆ مورشـیدێكی كـامڵی وەك ئەو حەزرەتە بێجگە لە سەبرو دان بەخۆدا گرتن هیچ بژاردەیـەكی دیكـەی لەبەردەمـدا نەهێشـتبوەوە. شـایانی باسـە كـە ئـەو حەزرەتـە لـەو سـەردەمەدا بێجگەلـە سـەختبونی سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی خانەقاو موریدو مەنسوبەكانی تاڕادەیەكیش سەردانی ئیرشـادی بۆ ناوچەكانی كوردستانی باشوریشی بۆ زەحمەت بووبو ئەویش بـەهۆی فـراوان بـوونی ئـەو بێباوەڕیە لەناو كۆمـەڵگادا بەشێوەیەك كە لەماوەی ئیرشـادی ئـەو حەزرەتـە لەكوردسـتانی باشوردا تەنها یەكجار ئیرشادی كردووە ئەویش لەناوچەی باڵەكایەتی و چۆمـان بووە.

هەروەها دوژمـنان و پیلان گێڕانـی دژ بـە حـەزرەتی بەهائـەدینی دووهـەم (قـدس سـره) لەوكاتـەدا توانیـان هەنـدێك نووسـراوی ناڕاسـت و هەڵبەسـتراو نـەك تـەنها بـەناوی ئـەو حەزرەتەوە بەڵكو بەناوی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی (قدس سره) جێگەداریشیەوە دروست بكەن و لەكوردستانی باشورو ڕۆژهەڵاتـدا بڵـاوی بكەنـەوە ئـەوەش بـەهۆی ئـەو كەشـە بێباوەڕیـەوە تائەندازەیەك كاریگـەربوو لـەناو دەروونـی هەنـدێك خـەڵكی ناشـارەزادا بـەڵام پاشـان ئـەو پیلانانـە لەلایـەن ئـەو دوو حەزرەتـەوە پوچـەڵ كرایـەوە. هەرلـەم بارەیـەوە خـودای مـەزن لەئایەتێكی پیرۆزدا دەفەرمووێت ﴿ومكرو ومكر الله والله خير الماكرين﴾ (آل عمـران، آيـة:٥٤). واتە: موشریك وبێباوەڕەكـان پیلانیـان دژ بـە بەرنامـەو پیاوەكـانی خـودا داڕشـت خـودای مـەزنیش پیلانی لەدژی ئەوان داڕشت بەڵام خودا باشترین پیلان داڕێژەرە.

ئەوە بوو پیلانی بێباوەڕان و دەستەو تاقمەكانیان لەماوەیەكی كەمدا شكستی هێنـاو نەیانتوانی هەمیشە زاڵبن بەسەر بیروباوەڕی كۆمـەڵگادا هەربۆیە بەلەناوچـونی عبـدالكریم قاسم و لاوازبوونی حزبی شیوعی هەندێك لەوانەی كە دژایەتی تەریقەتیان دەكرد شـێوازی

کاری خۆیانیان گۆڕی و لە بەرگی ئاین و تەریقەتدا خۆیان ڕازاندەوە بەئامانجی ئەوەی کە دوژمنی ناوخۆیی وێرانکاری زۆرترو زووتر دەهێنێتە دی، وەلەم کارەیاندا سەرکەوتنێکی بەرچاوو ماوە درێژتریان دەستکەوت کە تاوەکو ئێستاش ئەو شێوە کارەیان هەر بەردەوامە. لەم بارەیەوە دوو بەیتیەکی فارسی هەیە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

دشمن از هر حیلەئی فرومـانـد سر سلسلە دوستی بـجمباند

آنکـه آن کنـد بـه دوستـی کـه بـه دشمنی نتـوان کـرد

واتە:

دوژمن لە فێڵکردن کە دابمێنێت ناچار ڕشتەی دۆستی بەکاردێنێت

ئـەو کات وەهـا وێـرانی دەکات کە ئـەوەی نارەوایە لە دژی بکات

❊ ❊ ❊

وەکـو لەسـەرەتاوە ئاماژەمـان پێکـرد لـەدوای کودەتاکـەی سـاڵی (١٩٥٨)دا کـە عبدالکریم قاسم لە دژی حوکمی پادشایی ئەنجامیداو هەروەها بەهێزبوونی حزبی شیوعی ئەوکاتەی عێراق ئیدی مورشیدو زانا ئاینیەکان نەیاندەتوانی بەئاسانی ئیشوکاری خۆیـان ئەنجام بدەن وەژیانیان کەوتە مەترسیەوە بەتایبەت لەکوردستانی باشوردا، بەوشـێوەیەی کـە لەزمانی هەندێك مەشایخ و زاناکانەوە بیستوومە ئەو تاقمە بێ بـاوەڕە هەڵدەکوتنـە سـەر ماڵی چەند مورشیدێکی پایە بەرزی تەریقەت و هەڕەشەیان لێدەکەن کە ئەگـەر تەئیـدمان نەکەن و لەناو خەڵکدا بانگەشەمان بۆ نەکـەن ئـەوا بـێ ڕێـزی دەکـەین بـەخۆتان و مـاڵ و منداڵتان، وەئیدی ئەو مورشید و زانا ئاینیانە یالەسـەر بانگهێشـتی ڕژێمـی پەهلـەوی یـا بەناچاری و بەبێ بانگهێشت کوردستانی باشوریان بەجێهێشت و نیشتەجێی وڵاتی ئێـران بوون وەئیدی لە زەبرو ستەمی حزبی شیوعی ئەوکات ڕزگاریان بوو.

بەڵام حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) خۆڕاگرانە لەشوێنی خۆی مایەوەو کۆچی نەکرد بۆ هیچ وڵاتێك هەرچەندە مانەوەشی زۆر ئەستەم بوو وەدەبوایە بەحیکمەت و داناییەکی زۆرەوە ڕووبەڕوی ئەو تاقمە بێباوەڕە ببوایەتەوە لەکاتێکیشدا ئەگەر ئەو حەزرەتە کۆچی بکردایە بۆ کوردستانی ڕۆژهەڵات لەو هەموو ئازارو چەرمەسەریە ڕزگاری دەبوو بەڵام بەهۆی ئەو پەروەردە کردنەی کە حەزرەتی حسامەدین و مورشیدە گەورەکانی ڕێبازی پیرۆزی نەقشبەندی (قدس سرهم) پیشانیان دابوو بە جێگەدارەکانیان، ئەوەبوو کە حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) هیچ کات ڕازی نەدەبوو خۆی بسەپێنێت بەسەر خەڵکانی دیکەداو ببێت بەئەرك بەسەریانەوە هەربۆیە تائەو کاتەی لەلایەن موریدەکانیەوە دەعوەت نەکرا بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەڕێ نەکەوت. هەروەها لەگەڵ ئەمانەشدا حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) بەشێوەیەك پەروەردەی کردبوو کە ڕەنج و ئازار قەبوڵ بکات لەناو خاك و گەلەکەیدا بەڵام سەرشۆڕو ژێر دەستەی بێگانە نەبێت.

کاتێك ئەو مەشایخ و زانا ئاینیانە دەچنە ئێران و بارودۆخی عێراق دەگێڕنەوە بۆ هاوڵاتیانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لە زوڵم و ستەمی شیوعیەکان بەرامبەر بەئاین و پیاوچاکان، بەوهۆیەوە موریدو مەنسوبەکانی ڕێبازی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) دەکەونە هەوڵدان بۆ دەعوەت کردنی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) بۆلای خۆیان تاپارێزراو بێت لەو تاقمە ستەمکارە هەربەو مەبەستە چەند کەسێك وەك نوێنەری خۆیان دیاری دەکەن و دەیانێرن بۆ خزمەتی، ئەو حەزرەتەش دەعوەتەکەیان قەبوڵ دەکات پاشان لەبەرئەوەی ناحەزان و دوژمنان هەواڵی کۆچی ئەو حەزرەتە بەرەو کوردستانی ڕۆژهەڵات نەگەیەننە حزبی شیوعی ئەوکات، ناچار لەشەوداو بەنهێنی گوندی باخەکۆن بەجێ دەهێڵێت و بەرەو گوندی کەیمنەی سەرسنور بەڕێ دەکەوێت وەحاجی مەلائەحمەد (بەڕەحمەت

بێت) کە خەلیفەی حەزرەتی حسامەدین بووە (قدس سرە) لەوگوندەدا لەخزمەت ئەو حەزرەتەدا دەبێت، پاش چەند ڕۆژێك مانەوەی لەکەیمنە موریدەکانی لەشاری پاوەوە دێنە خزمەتی و دەعوەتی دەکەن بۆ شارەکەیان وەلەماوەیەکی کەمدا دەنگوباسی کۆچی ئەو حەزرەتە بەرەو کوردستانی ڕۆژهەڵات دەگاتە شاری سنە وەبەهۆی ئیخلاس و مەحەبەتێکی تایبەتی موریدو مەنسوبەکانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سرە) لەوشارەدا بۆ حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سرە) یەکسەر دەست بەکار دەبن بۆ ڕازی کردنی ڕژێمی ئەوکاتەی ئێران تاوەکو ڕێگەبدات ئەو حەزرەتە لەشارەکەیاندا نیشتەجێ بێت و بتوانن بەباشی سوود لە فەیزو بەرەکەتە مەعنەویەکانی وەگرن، وەئەوەی لەتوانایاندا بوو بۆئەو مەبەستە کۆششیان کرد تاسەرەنجام ڕژێمی پەهلەوی ڕازی دەبێت کە تەشریف ببات بۆ شاری سنە.

حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سرە) بۆماوەی سیانزە ساڵ لەو شارەدا ژیاوە وەلەوماوەیەدا ڕێزو خۆشەویستیەکی فراوان و بەردەوامی لەناو دڵ و دەروونی هاوڵاتیان و بەرپرسانی سنەدا هەبووە بەشێوەیەك لەکاتی ناو بردنی ئەو حەزرەتەدا شادمانی ڕووی تێدەکردن، وەهۆکاری ئەو هەمووە ڕێزو خۆشەویستیە کە خەڵك و دەسەڵاتی ئەوکاتەی ئێران بەرامبەر بەو حەزرەتە دەریان دەبڕی ئەوەبوو کە ملکەچی فەرمانی هیچ زۆردارو حاکمێکی ستەمکار نەبوو وەهەموو ئاوات و خۆشیەکانی ژیانی خۆی گرتبوویەوە لەپێناو تەریقەت و گۆشەگیری سلوکدا.

هەروەها لەماوەی ئەو سیانزە ساڵەدا دوو سەفەری ئیرشادی ئەنجامداوە یەکەم سەفەری بەرەو ناوچەکانی هەوشاری سەقزو شاری بۆکان و سابلاغ بووەو دووەم سەفەریشی بۆ ناوچەکانی کەڵاتەرزان و ژاوەرۆی سەر بەشاری مەریوانی ئەوکات بووە وەلەبەر ئەوەی کە ناسنامەی ئێرانی پێنەدراوە ئەویش بەهۆی ئەو هەڵوێستە مەزنانەی کە پێشتر باسمان کرد

**هەربۆیە بە ئاوارە ئەژماردەکرا لەلای ڕژێمی پەهلەوی و دەبوایە بەگۆشەگیری ژیانی بەسەر بردایە.**

## ( چەند نموونەیەك لە خەواریقەكانی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) )

خەواریقەكانی ئەو حەزرەتە گەلێك زۆرو مەشهورن بەڵام بەندە چەند نموونەیەكم لێرەدا هێناوەتەوە كە بەلامەوە زۆر گرنگ و پڕ واتان:

١ـ سۆفی محمدی پاوەیی كە یەكێكە لە موریدە ڕاستگۆو بەوەفاكان بۆی گێڕامەوە كەوا چووبو بۆ خزمەتی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) لەشاری سنەو عەرزی كردبوو قوربان موریدو مەنسوبەكانی شاری پاوە زۆر موشتاقی زیارەتی جەنابتانن و هەموویان بۆیان ناكرێت بێنە سنە بۆ خزمەتتان هەروەها ئێوەش تەنها ئەوكاتە نەبێت كە لەعێراقەوە تەشریفتان هێنا بۆ ڕۆژهەڵاتی كوردستان ئیدی سەردانی پاوەتان نەكردوەتەوە لەبەرئەوە كاتێك دیاری بكەو تەشریف بێنە بۆ سەردانی ئیرشادی ئەو ناوچەیە ئەو حەزرەتەش لەوەڵامدا فەرمووبوی برا ئەوە ڕاستە، بڕیارو ویستی خودا بەوشێوە بوو كە نەمتوانی سەردانتان بكەم هەروەها بەهۆی ئەوەی كە من هاووڵاتیەكی عێراقیم و لەلای دەوڵەتی ئێران بەئاوارە ئەژمار دەكرێم بۆیە زۆر ناتوانم لەناو موریدو مەنسوبەكاندا دەركەوم إنشاالله لە داهاتوودا دێم بۆ پاوەو شەوێك لە مزگەوتی (حەزرەتی عبدالله)دا دەبمە میوانتان، سۆفی محمد ووتی لەو فەرمایشتەی بەچاكی تێنەگەشتم كە مەبەستی چی بوو لە میوانی و مزگەوتی حەزرەتی عبدالله، تاوەكو چەند ساڵ تێپەڕی بەسەر ئەم دیدارو گفتوگۆیەداو ڕۆژێكیان هەواڵی كۆچی دوایی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەمیان (قدس سره) پێ ڕاگەیاندین وەلەناو حەشاماتێكی زۆر گەورەدا تەرمی پیرۆزی ئەو حەزرەتەیان هێنایە شاری پاوە ئەو ڕۆژە پاوە وەك مەیدانی حەشری لێ هاتبوو ئەوەندە قەرەباڵغ بوو ئەوكاتە من ئەو فەرمایشتانەم لەیاد نەمابوو تاكاتێك كە ئەو خەڵكەی لە خزمەت تەرمەكەیدا هاتبون و تەشیعیان دەكرد ووتیان بەهۆی ئەوەی كە دەمەو ئێوارەیەو درەنگ وەختە فریای ناشتنی

تەرمی پیرۆزی ناکەوین و تا دەگەینە گوندی تەوێڵە شەومان بەسەرداد‌یت بۆیە تەرمەکەی ئیمشەو لە مزگەوتی (حەزرەتی عبداللە)دا دادەنێین و سبەی بەرێ دەکەوین لەوکاتەدا فەرمایشت و خەواریقە مەزنەکەی ئەو حەزرەتە هاتەوە یادم و فرمێسك بەچاومدا هات و مونقەلیب بووم.

٢ـ وەهابی شاتری کە خەڵکی شاری سابڵاغەو موریدێکی موخلیس و بەوەفای حەزرەتی بەهائەدینی دووهەمە (قدس سره) بۆی گێڕامەوەو ووتی لەگەڵ خێزانمدا ڕۆشتین بۆ شاری سنە بەمەبەستی سەردانی ماڵی خەزورەم شەوێکیان بڕیارماندا بچین بۆ زیارەتی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) کاتێك گەشتینە خزمەتی زۆر نەخۆش بوو وەلە حوجرەکەیدا ڕاکشابوو بۆمان دەرکەوت کە ئەو نەخۆشیە نیشانەی کۆتایی ژیانیەتی، پاش ماوەیەك فەرمووی کتێبەکەم بۆ بهێنن چەند لاپەڕەیەکی هەڵدایەوەو ئەو شیعرانەی کە لەوڵاتی ئەفغانستان بۆ حەزرەتی حسامەدینی (قدس سره) نووسیبوو کەوتە بەرچاوی و هەندێکی لێ خوێندەوەو فرمێسك بە چاوی موبارەکیدا هاتە خوارەوە پاشان فەرمووی ئەو تەلەفونەم لێ نزیك بکەنەوە تەلەفونەکەمان بردە خزمەتی، ژمارەی پارێزگاری سنەی وەرگرت بەناوی (ڕەئوفی) کە ئەو حەزرەتەی یەجگار خۆش دەویست و ڕێزی لێ دەگرت فەرمووی ئاغای ڕەئوفی من ئەوەندەم نەماوە کە بەجێتان بهێڵم وەتا هەفتەی داهاتوو میوانتانم داوات لێ دەکەم لەدوای ڕۆشتنم ئاگات لە ئەولادەکانم بێت کەسی دڵسۆزیان لەم وڵاتەدا نیە کە غەمیان بخوات، هەر بەوشێوەی کە ئەو حەزرەتە فەرمووی بۆ هەفتەی دوای ئەو دیدارو گفتوگۆیە فەرمایشتەکەی هاتەدی و کۆچی دوایی کرد وەئەم خەواریقە لەناو خەڵکدا بڵاوبوویەوەو زۆر گرنگ بوو لەلایان.

٣ـ عەلی خانی ئەمیری خەڵکی شاری بۆکانەو بەهۆی ئەوەی کە مـــامی خەلیفەی

**حـەزرەتی حسـامـەدین** (قـدس سـره) **بـووە بـەناوی شـێخ ئیسـماعیلی زەبیحـی** (بەڕەحمـەت بێـت) **تاڕادەیەك مـەحەبـەت و ئیخلاسـی بەرامبـەر بـەو حەزرەتـەو جێگـەدارەکانی هـەبوبو بـەڵام تەریقەتی لەخزمـەتیاندا وەرنەگرتبوو تائـەوەی کـە دەگاتـە خزمـەتی حـەزرەتی بەهائـەدینی دووهەم** (قدس سره) **، درێژەی چۆنیەتی تەمەسوکی خۆی بەم شێوەیە بۆ گێڕامـەوەو ووتـی بـۆ ماوەیەك لەهەوڵی ئەوەدا بـووم لـە خزمـەت مورشـیدێکی کامیـل وموکەمیلـدا تەریقـەت وەربگرم تاوەکو بەهرەی مـەعنەوی و ڕۆحیم دەسبکەوێت، باسی گەورەی و توانای مـەعنەوی هەندێك مـەشایخم بیستبوو کە مـەشهور ترینیان حـەزرەتی بەهائـەدینی دووهـەم بـوو** (قـدس سره) **هەربۆیە بڕیارمدا کە بچمە خزمـەتی ئەو مورشیدانە تاوەکو لەنزیکەوە بیانبینم و بـۆم دەرکەوێت کامیان شـیاوترە کـە تەمەسـوك بکـەم لەخزمـەتیـداو بـبم بەموریـدی یەکـەمجار چـوومـە خزمـەت حـەزرەتی شـێخ محمـد بەهائـەدینی دووهـەم** (قـدس سـره) **هـەر کـە سـواری ئۆتۆمبیلەکە بووم و بەڕێکەوتم بەرەو شاری سنە هەستم بە بۆنی عـەترێکی زۆرخـۆش کـرد کە لەو سەفەرەمدا بەردەوام ئەو بۆنە لەلوتمدا بوو لەدڵی خۆمدا ووتم خـودا خـۆی دەزانێـت ئەم بۆنە خۆشە لوتفو بەرەکەتی کام لەم مورشیدانەیە.**

**پاش ئەوەی گەیشتمە خزمەت ئەو حەزرەتەو چەند ڕۆژێك لە سنە مامەوە ڕوخسـەتم لێ وەرگرت و بەڕێکەوتم بەرەو ناوچـەیەکی دیکـەی پارێزگـای سـنە کـە شـێخێکی مەشـهوری تێدابوو، وەلەگەڵ دەرچوونم لەشاری سنە ئەو عەترە بـۆن خۆشـە نـەماو ئیـدی هەسـتم پـێ نەدەکرد زۆر گرنگیم پێنەداو درێژەمدا بەسـەفەرەکەم تاگەیشـتمە نزیـك ئـەو شـوێنەی کـە شێخەکەی تێـدابوو لەوکاتـەدا ئۆتۆمـبیلەکـە لـەئیش کـەوتو مەکینەکـەی خـراپ بـوو ئـەو سەردەمەش ڕێگاوبـان خـاکی بـوو قیرتـاو نـەکرابوو هـەروەها ئۆتـۆمبیلی ئـەو ناوچـەیەش بەئەستەم دەست دەکەوت چەند ڕۆژێك لەوێدا ماینەوە ئەوکات بۆم دەرکـەوت کـە هۆکـاری**

پەیدابوون و نەمانی ئـەو عـەترەو خـراپ بـوونی ئۆتۆمبیلەکـە هـەمووی کـاری مـەعنـەوی حەزرەتی بەهائـەدینی دووهەمـە (قـدس سـره) وەخـودای تعـالی ئـەوی بەمورشـیدی تەریقـەت هەڵبژاردوەو پشتیوانی لیٚ دەکات ئیدی یەکسەر گەڕامەوەو لەخزمەتیدا تەریقـەتم وەرگرتـو بووم بەموریدی.

٤ـ حاجی نەبی بوزورگی بۆی گێڕامەوەو ووتـی حـەزرەتی بەهائـەدینی دووهـەم (قـدس سـره) کە تەشریفی هێنایە شاری سنە خانوویەکی کرێیان بـۆ گرتبـوو لەوکاتـەدا بـەباوکمی فەرمووبو بیستومە دوکانی قاڵی فرۆشیت هەیە بۆیە پێویستمان بەهەندێك قاڵیـە بـەڵکو چەند دانەیەکمان بۆ بنێریت بە قیمەت. باوکم (بەڕەحمەت بێت) بەحوکمی ئـەوەی کـە موریـدی حەزرەتی حسامەدین بـوو (قـدس سـره) وەخـاتری حـەزرەتی بەهائـەدینی دووهـەمی زۆر لـەلا گرنگ بوو، هەربۆیە قاڵیەکانی ئامـادەکردو خسـتیە نـاو ئۆتۆمبیلەکەیـەوە بـەڵام بـەهۆی چەند ئیشێکی بەپەلە کەبۆی هاتبووە پێشەوە بۆی نەکرا خۆی بیانگەیەنێتە خزمـەتی بۆیـە ئەوکارەی بەمـن سپاردو پێی ووتم ڕۆڵە ئەگەر ئـەو حەزرەتـە پرسـیاری نرخەکـەی لێکردیـت خاتری بگرەو بەکەمتر پێی بفرۆشە مـنیش لەوەڵامـدا ووتم باشە بەڵام بەهۆی ئەوەی کە مـن لەوکاتەدا لاو بووم و ئاوات وئارەزووی زۆرم هەبوو کە بەوشێوە نەبوایـە بەدەسـتم نـەدەهێنا بڕیارمـدا کـە دووهێنـدەی نرخەکـەی پـیٚ ڕابگەیـەنم و زیادەکـەی هـەڵگرم بۆخـۆم کاتێـك قاڵیەکانم گەیاندە جیٚ ئەو حەزرەتە بەدەستی موبـارەکی قاڵیـەکانی هەڵدایـەوەو فـەرمووی (بەه بەه) زۆر جوانن قیمەتەکەیان چەندە؟

مـنیش بەو نرخەی کە خۆم دیاریم کردبوو وەڵامم دایەوە پاشان ئەو حەزرەتە فەرمووی نەبی ڕۆڵە بەو زانستەی کە خودا بەمنی بەخشـیوە ئـەوە قیمـەتی ئـەم قاڵیانـە نیـە بـەڵکو تۆزێك لەوە زیاترە کـە باوکـت بڕیـاری دابـوو پێمـان بڵێیـت. حـاجی نـەبی ووتـی کـە ئـەو

حەزرەتە فەرمایشتەکەی تەواوکرد لە خەجاڵەتیدا نەمزانی چی بکەم هەرئەوەم پێکرا کە بەپەلە لەوشوێنەدا نەمێنم وەدوای چەند ڕۆژێك چوومەوە خزمەتی و تەریقەتم لەسەر دەستی وەرگرت.

**٥- مەلا سەید ئەحمەدی تاڵشی** (بەرەحمەت بێت) لەکاتی پرسەی حەزرەتی شێخ ئەحمەددا (قدس سره) تەشریفی هێنابوو بۆ سەرەخۆشی پاش چەند ڕۆژێك لەدوای تەواوبوونی مەجلیسی پرسەکە چووینە خزمەتی وەك ڕەددی زیارەت لەوکاتەدا چۆنیەتی گەیشتنی بەخزمەت حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم و (قدس سره) وەرگرتنی تەریقەت لەخزمەتیدا بۆ گێڕاینەوەو فەرمووی ئەوکاتەی کە لە تاڵش فەقێ بووم دەنگوباسی زانا ئاینیەکانی کوردستانم دەبیست کە زۆر بلیمەت و شارەزان لە زانستەکانیاندا هەربۆیە یەجگار ئاواتە خواز بووم کە بەرەوە ئەو ناوچەیە بەڕێ بکەوم بۆ بەدەست هێنان و فێربوونی زانستی شەرعی لە خزمەتیاندا بەڵام بەهۆی ناشارەزا بوونم لەڕێگەوبانی کوردستان و نەبوونی ڕێنیشاندەر نەمدەتوانی بەرەو کوردستان بەڕێ بکەوم تائەوەی شەوێکیان لەخەودا گەیشتمە خزمەت شەخسێکی نورانی کە پۆشاکی پیاوچاکانی لەبەردابوو فەرمووی سەید ئەحمەد وەرە بۆ شاری سنە من لەوێم ئەوکات دەتوانیت لای من بەئاسانی ئەو زانستانە بخوێنیت عەرزم کرد شارەزای ڕێگەی سنە نیم و لەوەوپێش نەگەشتومەتە خزمەت جەنابت ئیتر چۆن دەتوانم بێمە سنە بۆ خزمەتتان؟ فەرمووی من شێخ محمد بەهائەدینی دووهەمم ئەوەش نەخشەی ئەو ڕێگایەیە کە دەتگەیەنێتە شاری سنە چاك تەماشای بکە بالەیادت نەچێتەوە. بەوشێوەی کە ئەو حەزرەتە ڕێگەکەی پێ نیشاندام بەڕێکەوتم و بۆ ڕۆژی دوایی گەیشتمە شاری سنە پاش ماوەیەك گەیشتم بەدوو هاوڵاتی ئەو شارەو لێم پرسین ئایا شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) دەناسن؟ ووتیان بەڵێ پاشان ناونیشانیماڵەکەیم پرسیو

بەوشێوە تاگەیشتمە بەردەم دەرگای ماڵی ئەو حەزرەتە کاتێك داوای ڕوخسەتم کرد کە بچم زیارەتی بکەم فەرمووی سەید ئەحمەد دواجار هاتی یاخودا بەخێربێیت. ئیتر من لەوکاتەوە بۆماوەی چەند ساڵێك لەخزمەتیدا بووم وەلەوماوەیەدا زانستە شەرعیەکان و پلەکانی تەریقەتم لەخزمەتیدا تەواوکرد پاشان بڕیارمدا لە خزمەتی مورەخەس بمو بگەڕێمەوە بۆ تاڵش، بەڵام ئەو حەزرەتە فەرمووی تۆ ئێستا گەشتووی بەپلەی ئیرشادی مەعنەوی بۆیە تائیجازەی خەلافەت وەرنەگریت نابێت بڕۆیت وەهەر لەهەمان ڕۆژدا بەدەستی موبارەکی خۆی ئیجازەی خەلافەتی بۆ نووسیم و ئەوجا بەرێزێکی تایبەتیەوە ڕەوانەی کردم بۆ ناوچەی تاڵش.

## ( مێژووی كۆچی دوایی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم و (قدس سره) دیاری كردنی جێگەدار لەلایەن ئەو حەزرەتەوە )

حاجی (حبیب الله)ی بۆڕیدەری كە یەكێكە لەموریدەكانی حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدین (قدس سره) بۆی گێڕامەوەو ووتی هەواڵی ناساغی ئەو حەزرەتەمان پێگەشت بەشێوەیەك كە بۆمان دەركەوت ئەو ناساغیە نیشانەی ئەوەیە كە ئیتر چاك بوونەوەی مەحاڵەو كۆتا ساتەكانی ژیانیەتی بەوهۆیەوە هەندێك لە پیاو ماقوڵانی گوندی بۆڕیدەر[20] بەرێ كەوتن بۆ خزمەتی ئەو حەزرەتەو منیش لەگەڵیاندا چووم پاش ئەوەی دەستی موبارەكیمان زیارەت كرد بینیمان زۆر لاوازبوبو وەڕەنگی دەموچاوی پیرۆزی بەتەواوەتی زەرد هەڵگەڕا بوو هەربۆیە شكمان نەما لەوەی كە ئەمجارە دوا سەردانمانە بۆ لای ئەو حەزرەتەو دووبارە ناگەینەوە خزمەتی لەبەرئەوە بەجارێك هەموومان خەمو پەژارە دایگرتین و فرمێسك بەچاوماندا هاتە خوارەوە، پاشان ئەو حەزرەتە فەرمووی براكانم بۆ واخەمبارو بێتاقەتن بڕیاری خودا خەمباری پێناوێت بەڵكو دەبێت خۆشحاڵبن بەوكارەی كە خودا پێی خۆشە بێتەدی هەروەها مەرگیش هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوەو تەنها بۆ من دیاری نەكراوە.

عەرزمان كرد قوربان دوای جەنابت ڕوو لەكێ بكەین كە بەبینینی دڵمان شادبێت و سوودی ڕۆحی و مەعنەوی لێ وەربگرین فەرمووی براكانم مەن شێخ ئەحمەد جێگەدارمەو دەسەڵاتی مەعنەوی یەجگار بەهێزە،

عەرزمان كرد جا قوربان گیان حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) توانای تەسەڕوفی مەعنەوی ئەوەندەی جەنابت بەهێزە كەوا لە ڕۆحی موریدەكاندا كاریگەربێت، لەوەڵامدا

---

[20] گوندێكی ناوچەی ژاوەرۆیە ..................... نووسەر.

فەرمووی سوێند بەخودا حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) نابێت شانازی بەمنەوە بکات کە کوڕی ئەوم بەڵکو دەبێت من شانازی بە شێخ ئەحمەدەوە بکەم کە ئەو کوڕمەو جێگەدارمە.

لەکۆتاییدا عەرزمان کرد قوربان لەحاڵی حازردا حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەعێراقە و بۆ ئێمە ئاسان نیە کە بگەینە خزمەتی، ئەو حەزرەتەش فەرمووی تائەوکاتەی کە شێخ ئەحمەد دێت بۆ ئیرشادی ئێران کەمالی کوڕم وەك نوێنەری ئەو سەرپەرشتی موریدو مەنسوبەکان بکات و پاش لە دونیا دەرچونیشم بالیباسی ئیرشاد لەبەربکات بۆئەوەی ئێوە لەدوای من نائومێدو بێ سەرپەرشت نەبن.

## نامەی ژمارە: (٢)



نور بەر دوو چاوم شیخ احمد چاوت ماچ اکم خبرم ادریی
یکی یا نگ لیدرت، نخوش بووم دکتر و دەرمان غیرە زور نیر حمیت
کمی چاک بووم ارادەی آخر ایدی بی تەوک کە مقام حضرت حسام الدین
راگری وچاوت لەبرا و هیفران یاوکت بێ فی جمدم اذنم داوە
وحدت اکم مقام طریقت ئیش امە راگیرکی اسال لە بەر
ئیشە امە پاشا لەوت وەرگرە بێ لوازمە بلکو کمی مرید و طلوب
آکا دار بکیتەوە اتیر تو کورگورە وچاو دار یاوکو و بابر خوت
لکیف خوشە تو و خدای خوت

**(دەقی وەسیەت نامەی جێگەداری حەزرەتی شێخ ئەحمەد لەلایەن حەزرەتی بەهائەدینی دووهەمەوە** (قدس سرهما) **کە بە دەستوخەتی پیرۆزی خۆی نووسیویەتی و واژووی کردووە)**

دەقی وەسیەت نامەی جێگەداری حەزرەتی شێخ ئەحمەد لەلایەن حەزرەتی بەهائەدینی دووهەمەوە (قدس سرهما) بەڕێنووسی ئەم سەردەمە:

نوری هەردوو چاوم شێخ ئەحمەد چاوت ماچ دەکەم، خەبەرم دەپرسی یەك مانگ بەشیدەت نەخۆش بووم دکتۆرو دەرمانو غەیرە زۆر بەزەحمەت کەمێك چاك بووم ئەوەڵ وئاخری ئومێدی من تۆی کە مەقامی حەزرەتی حسامەدین ڕاگریتو چاوت لە براو سەغیرانی باوکت بێت، من عومرم ئەوەندە نەماوە وەسیەت دەکەم مەقامی تەریقەت انشاالله ڕاگیربکەیت وەئەمساڵ بۆ بەهار انشاالله پاسپۆرت وەرگرەو وەرە بۆ ئێرە بەڵکو کەمێك موریدو مەنسوبەکان ئاگادار بکەیتەوە ئیتر تۆ کوڕی گەورەو جێگەداری باوك وباپیری خۆتی کەیفی خۆتە تۆو خودای خۆت.

واژووی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره)

* * *

لەپاش نووسینی ئەم نامەیە بەچەند ڕۆژێك ئەو حەزرەتە لەبەرواری (١٩٧١)ی زاینیدا کۆچی دوایی دەکات و تەرمی پیرۆزی لە سنووری نەوسوود تەوێڵەوەو لەمەراسیمێکی کەم وێنەدا تەشیع دەکرێت بەرەو گوندی تەوێڵەو لەتەنیشت مەرقەدی حەزرەتی بەهائەدینی یەکەمی باپیریدا (قدس سره) ئەسپەردەی خاك دەکرێت، شایانی باسە ئەو حەزرەتە دوانزە کوڕی هەبووە کە کوڕە گەورەکەی بەناوی مەرحومی شێخ مەحمود بووە بەڵام لەتەمەنی لاوێتیداو لەحاڵی حەیاتی خودی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەمدا (قدس سره) کۆچی دوایی کردووە، وەناوی کوڕەکانی دیکەی ئەو حەزرەتە ئەمانەی لای خوارەوەیە:

١. شێخ ئەحمەد

٢. شێخ کەریم

٣. شێخ مستەفا

٤. شێخ عەتا

٥. شێخ کەماڵ

٦. شێخ جەلال

٧. شێخ عەدنان

٨. شێخ جەمال

٩. شێخ فاروق

١٠. شێخ جەمیل

١١. شێخ فوئاد

❊ ❊ ❊

وێنەی ژمارە: (١٠)



(حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامی نەقشبەندی (قدس سره))

## ( هەندێك لە بەسەرهات و ڕووداوە گرنگەكانی ژیانی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامی نەقشبەندی (قدس سره) )

حەزرەتی شێخ ئەحمەد مولەقەب بە (نورەدین) كوڕی پێگەشتوو جێگەداری حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەمی حسامی نەقشبەندیە (قدس سرهما). لەساڵی (١٩٢٢)ی زاینی بەرامبەر بە (١٣٤٣)ی كۆچی لەگوندی گوڵپی سەر بەناحیەی خورماڵ لەدایك بووەو ناوی دایكی بەڕێزی سەید زادە ڕەزیەی خانەگاییە (بەڕەحمەت بێت). هەر لەتەمەنی منداڵیداو لەگوندی باخەكۆن دەست دەكات بەخوێندنی قورئان و زانستەكانی فقە وسەرف و نەحو لەخزمەت مەرحومی مامۆستا مەلا خالیدی موفتی سنە، وەلەهەمان كاتدا كاری مەعنەوی و ئادابی پەروەردەكردنی ڕۆحیی لەسەر ڕێبازی نەقشبەندی لەخزمەت حەزرەتی حسامەدینی (قدس سره) باپیریدا ئەنجامداوە، پاشان تەشریف دەباتە گوندی خانەگای سەر بەشارۆچكەی پاوە كە لەوسەردەمەدا موڵكی خاڵوانی بووە بەمەبەستی فێربوونی زمانی فارسی و لەخزمەت مامۆستا مەلا محمدی قادر مەرزیدا (بەڕەحمەت بێت) كتێبەكانی گولستان و بوستانی سەعدی شیرازی دەخوێنێت.

لەپاش كۆتایی هاتنی خوێندنی دەگەڕێتەوە بۆ خزمەتی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) بۆ ئەوەی درێژە بدات بە پەروەردە كردنی ڕۆحیی و مەعنەوی وەبەهۆی تەوەجوهی مەعنەوی حەزرەتی حسامەدینەوە (قدس سره) بەباشترین شێوە پلەكانی تەریقەتی بڕی. حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) زۆربەی تەمەنی لاویەتی خۆی لەگوندەكانی باخەكۆن و زەڵمو ناحیەی خورماڵ لەخزمەت شێخی باپیریدا بەسەر بردووە. ئەو حەزرەتە بۆی گێڕامەوەو فەرمووی لەو سەردەمەداو لەوەرزی هاویندا حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) تەشریفی دەبرد بۆ هاوینە هەواری زەڵم كە ئەوكات موڵكی ئەو حەزرەتە بوو وەبەردەوام

قەرەباڵغیەکی زۆر لە موریدو مەنسوب و میوان دەهاتن بۆ زیارەتی و بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك دەمانەوە، هەموو دەمەو ئێوارەیەك ئەو حەزرەتە بە موریدەکانی دەفەرموو مەحمودو ئەحمەدی کوڕەزام بۆ بانگ بکەن بالە ڕوبەڕومدا بوەستن و قەسیدەی بوردە بخوێنن پاش تەواوبوونی قەسیدەکە لەحاڵێکدا کە فرمێسك دەهات بەچاوی پیرۆزیدا بانگمانی دەکرد بۆ ئەوەی بچینە پێشەوە بۆ خزمەتی پاشان ناوچاومانی ماچ دەکردو زۆر دۆعای خێری بۆ دەکردین.

هەروەها حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) ئەمەشی بۆ گێڕامەوەو فەرمووی ئەوکاتەی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) کۆچی دوایی کرد حاڵی ئێمە زۆر پەشێوو پڕ لەغەم بوو وەنائارامی و بێ قەراریەکی زۆر بەوهۆیەوە ڕووی لەناوچەکە کردبوو، لەپاش کۆتایی هاتنی مەراسیمی سەرەخۆشی ئەو حەزرەتە من لەخانەقای باخەکۆندا مامەوەو درێژەم دایەوە بەبەرنامەی سلوکی تەریقەت، وەئەو کەسانەی بۆ خزمەتی سالکەکان دیاری کرابوون مەرحومی خەلیفە سەید تاهای لۆن بوو کە لەو کاتەدا بەرپرسیاری خانەقاو سالکەکان بوو هەروەها تەوەجوهی مەعنەوی لە سالکەکان دەکرد وەبەرپرسی ئامادەکردنی خواردنی سالکەکان مەلا مارفی سنەیی بوو خواردنیشمان بریتی بوو لە قاپێکی شۆرباو یەك نانی بچوك کە بەزمانی هەورامی پێی دەوترێت (خەپلە).

هەروەها حەزرەتی شێخ ئەحمەد فەرمووی لەپاش چەند مانگێك لەوەفاتی ئەو حەزرەتە ڕۆژێکیان حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سرهما) ناردی بەشوێنمداو فەرمووی ڕۆڵە لەپاش وەفاتی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) هەندێك کێشەمان بۆ هاتوەتە پێش کە پەیوەندی بە کاروباری خانەقاو میوانەکانیەوە هەیە وەئەگەر چارەسەر نەکرێت ئیشوکارەکان پەکی دەکەوێت هەربۆیە خۆت ئامادەبکەو بڕۆ ببە بە سەرکاری زەویەکانی

شارەزوورو بەزوویی بەرهەمەکەی بنێرە بۆم، ئیتر من خانەقای باخەکۆنم بەجێهێشت و فەرمانەکەیم جێبەجێ کردو بووم بەسەرکاری ئەو حەزرەتە لەشارەزووردا وەبۆ ماوەیەك بەوشێوەیە بەردەوام بووم، ڕۆژێکی گەرمی هاوین لەزەویەکانی تەپەکەل بەسەر فەردە چەڵتوکەکانەوە پاڵکەوتبوم بۆ پاراستنی تاوەکو نەیاندزن چونکە لەو سەردەمەدا بەهۆی گرانیو برسیەتیەوە دزی بەروبوم لەلایەن مرۆڤو دڕندەوە زۆر بووبو هەربۆیە

ئەگەر خاوەن زەوی و زار چاودێری بەروبومەکەی نەکردایە لەماوەیەکی کەمدا دەیاندزی. هەروەها حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) فەرمووی دوای ماوەیەك بەسەر فەردە چەڵتوکەوە خەوم پیاکەوت و لەخەومدا بینیم کە بەرەو گوندی باخەکۆن بەرێ کەوتووم پاش ماوەیەك گەشتمە سەر دووڕیانی گەچینە باخەکۆن وویستم لابدەمەوەو بڕۆم بەرەو خانەقا لەوکاتەدا حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) ئامادەبوو وەگۆپاڵە حەیزەرانەکەی بەدەستی موبارەکیەوە بوو فەرمووی (بابەلێ) ئەوە چی دەکەیت لێرە عەرزم کرد قوربان دەمەوێت بڕۆم بۆ خانەقا پاشان دەستی پیرۆزی ڕاکێشاو بەتوندی (خولامیەکەمی)[٢١] گرت و پرسیاری لێ کردم (بابەلێ) ئەوە چییە؟

لەوەڵامدا عەرزم کرد قوربان ئەوە خوڵامایەو ئێستا سەرکاری باوکمم بۆ سەروکاری زەویەکانی شارەزوور، ئەو حەزرەتەش فەرمووی (بابەلێ) ئەوە لابەو بڕۆ سەرکاری (بابە عەلی) خۆتبە ئەمە زیاتر پێویستە.

حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) فەرمووی کاتێك لەخەو خەبەرم بوویەوە تەوێڵم زۆر دەئێشا واتە شوێنی دەستی موبارەکی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره)، هەربۆیە دوابەدوای

---

[٢١] لەو سەردەمەدا (سەرکار) دەبوایە قژی سەر تەوێڵی زۆر بوایە وەکو نیشانەیەك لە جوتیارو خەڵکانی دیکە جیادەکرایەوە وەپێیان دەووت (خوڵامی) ........................ نووسەر.

ئەو خەو بینینە یەکسەر گەڕامەوە بۆ گوندی باخەکۆن و خۆم ئامادەکرد بۆ ئیرشادو سەردانی موریدو مەنسوبی ناوچەکانی شارەزوورو هەڵەبجە کە بەهۆی وەفاتی حەزرەتی حسامەدین و هەروەها مەشغوڵ بوونی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەمیش (قدس سرهما) بەسەرپەرشتی خانەقاو میوانەکان و هەندێك کێشەو بەربەست کە ناحەزانی تەریقەت بۆ ئەو حەزرەتەیان دروست کردبوو[٢٢] ئەو موریدو مەنسوبانە هێشتا خەمیان لەدڵدا مابوو وەنزیك بوو کە دڵسارد ببنەوە لەڕێبازەکەیان.

پاشان هەواڵی ئیرشادەکە گەیشتە حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) ئەو حەزرەتەش کەسێکی نارد تاوەکو بڕۆمە خزمەتی کاتێك چوومە خزمەتی فەرمووی ڕۆڵە بۆ زەویەکانت بەجێهێشت وەئەم کارەی کەتۆ دەستت داوەتێ هەروا ئاسان نیەو ئیجازەی مورشیدی کامیل وموکەمیلی پێویستە؟ منیش خەوەکەم بۆ گێڕایەوە ئەو حەزرەتەش فەرمووی هەرچەندە دەزانم لەم کاتەدا کاری ئیرشادو سەردانی موریدەکان بۆ تۆ زۆر سەخت و پڕکێشەیە بەهۆی پیلان گێڕی و بەهێزی ئەو بێ باوەڕو ناحەزانەوە بەڵام مادام فەرمانی حەزرەتی حسامەدینە (قدس سره) بۆ تۆ، ئەوا من ناتوانم ڕێگەت لێ بگرم هەروەها لەبەرئەوەی ناحەزان زیانی گەورەت پێ نەگەیەنن و بەربەستەکانی بەردەم من نەخەنە بەردەم تۆش وەدژایەتیەکانیان تەنها ڕووبەڕوی من ببێتەوەو تۆ پارێزراوبیت ئەوا من بەئاشکرا پشتیوانیت لێ ناکەم هەتاوەکو کارەکەت بەسەرکەوتویی ئەنجام بدەیت، ڕۆڵەگیان بڕۆ ئیرشادی خۆت بکەو ئومێدەوارم لوتفی خوداو هیمەتی ئەولیاکان هەمیشە پشتیوانت بن.

عەلی فەقێ ئەحمەد (بەڕەحمەت بێت) خەڵکی گوندی سەید خەلیل کە پیاوێکی موخلیس و خاکی و بەئەدەب بوو وەپەیوەندیەکی تایبەتی لەگەڵ مورشیدەکانی ڕێبازی حەزرەتی

---

[٢٢] لە بەشی دووهەمدا بە دوورو درێژی باسمان لەو تاقمانە کرد .................... نووسەر.

حسامەدیندا (قدس سره) هەبوو بۆی گێڕامەوەو فەرمووی لەتەمەنی لاویەتیدا بووم کە هەواڵ گەیشت بە موریدەکانی حەزرەتی حسامەدین لەگەرمیان کەوا حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سرهما) بەیداخی ئیرشادی لە شارەزوور هەڵگرتوەو زیکرو خەتمەو تەهلیلەی لەهەموو ناوچەکانیدا زیندوو کردوەتەوە، لەوکاتەدا پەیڕەوانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لەگەرمیان زۆر بێ نازو دڵتەنگ بوون وەلەدوای وەفاتی ئەو حەزرەتە شادمانی لەدڵ و دەرونیاندا نەمابوو وەپێویستیان بەمورشیدێك هەبوو بۆ ئەوەی شادی بخاتەوە ناو دڵەکانیان، هەربۆیە لەگەڵ بیستنی ئەو هەواڵە دڵ خۆشکەرەدا موریدەکان خۆشحاڵیەکی زۆر ڕووی تێکردن و یەکسەر هەندێك لەڕیش سپیەکانیان خۆیان ئامادەکرد وەك نوێنەری موریدەکانی دیکە تاوەکو بچن بۆ خزمەتی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) کە باوکیشم یەکێك بوو لەو ڕیش سپیانە لەوکاتەدا عەرزم کرد منیش ببە لەگەڵ خۆتدا پێم خۆشە بگەمە خزمەت ئەو حەزرەتە پاش ئەوەی گەیشتینە گوندی باخەکۆن بۆ ماوەیەك لەخانەقا پشومانداو دواتر هەواڵیان هێنا کە حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم ئێستا تەشریف دێنێت بۆ خانەقاو حەزرەتی شێخ ئەحمەدیش (قدس سرهما) لە خزمەتیدایە دوای زیارەت کردنی ئەو دوو زاتە لەلایەن موریدەکان و ئەهلی خانەقاوە یەکێك لە نوێنەرەکان عەرزی کرد قوربان موریدەکانی گەرمیان زۆر موشتاقی دیداری جەنابتن وەلەپاش وەفاتی حەزرەتی حسامەدینەوە (قدس سره) شادمانی ڕووی تێنەکردون هەربۆیە پێویستیان بە ئیرشادی جەنابتەو ئەگەر تەشریف بێنیت بۆ ئەو مەبەستە ئەوا ئەو خەمەیان دەڕەوێتەوەو دڵخۆشی و شادی جێگەی دەگرێتەوە، لەوەڵامدا فەرمووی بەهۆی ئیشوکاری خانەقای تەوێڵەو باخەکۆن و قەرەباڵغی میوانەکانمەوە لەئێستادا ناتوانم ئیرشادو سەردانتان بکەم.

عەرزیان کرد قوربان مادام جەنابت بەهۆی زۆری میوان وکاروباری خانەقاکانەوە ناتپەردەژێت ئیرشاد بکەیت نوێنەرێك دیاری بکە بالەبری جەنابتان تەشریف بێنێت بۆ ئیرشادی ناوچەی گەرمیان لەو کاتەدا ئەو حەزرەتە بۆماوەیەك بێ دەنگ بوو پاشان حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) فەرمووی ئەگەر جەنابی باوکم ئیجازەم بدات ئەوا من دێم بۆ ئیرشادی گەرمیان، موریدەکان بەبیستنی ئەم فەرمایشتە زۆر خۆشحاڵ بوون و عەرزی حەزرەتی (بەهائەدینی دووهەم)یان کرد (قدس سره) قوربان ڕەزامەندی خۆتمان پێ ڕابگەیەنە لەوبارەیەوە لەوکاتەدا ئەو حەزرەتە ڕووی کردە حەزرەتی شێخ ئەحمەدو (قدس سره) بۆ سێجار لێی پرسی شێخ ئەحمەد کوڕم ئامادەی بۆئەوەی ئیرشادی گەرمیان بکەیت؟ لەوەڵامدا عەرزی کرد بەڵێ قوربان، لەکۆتایی گفتوگۆکەیاندا ئەو حەزرەتە فەرمووی ڕۆڵەگیان بڕۆ ئیرشادی ناوچەی گەرمیان بکە انشاالله بەپشتیوانی خوداو هیمەتی حەزرەتی حسامەدین سەرکەوتوو دەبیت.

دوای ماوەیەك لە ئیرشادی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بۆ ناوچەکانی شارەزوورو گەرمیان دەنگوباسی ئەو زاتە زۆر بەزوویی بڵاوبویەوە بەناو خەڵکدا وەناحەزانی ئەو ڕێبازە پیرۆزە هەستیان کرد بەدووبارە گەشە کردنەوەی ڕێبازی پیرۆزی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) هەربۆیە یەکسەر دەست دەکەن بە داڕشتنی پیلانێکی نوێ لەدژی ئەو حەزرەتە ئەویش لەڕێگای نانەوەی ئاژاوەوە کە دەیانوویست بەربەست لەبەردەم ئیرشادو بەرنامەی مەعنەوی ئەو حەزرەتەدا دروست بکەن.

## ( هۆکاری کۆچی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لە باخەکۆنەوە بۆ هەڵە بجە )

بەندە لەتەمەنی هەشت ساڵیداو لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمی زاینیدا لەگەڵ هەندێك لە هاوڕێکانم دەچووین بۆ خانەقای حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بەمەبەستی خوێندنی قورئان لە خزمەت حاجی مەلا ئەحمەدی گۆباندا (خودا بیپارێزێت) کە ئەوکات سەرخەتمو مودەڕیسی خانەقای ئەو حەزرەتە بوو لەدوای تەوابوونی وانەی ڕۆژانەمان هەندێك ئامۆژگاری دەکردین وەچەند جارێك باسی مامۆستا مەلا ساڵحی تریفەی (بەڕەحمەت بێت) بۆ دەکردین کەوا زانایەکی گەورەیە وەبەهۆی ئەوەی کە یەکێکە لە خەلیفە مەشهورەکانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) خاوەنی دەسەڵاتێکی زۆری مەعنەویە لە تەریقەتدا کە بەتەوەجوهاتی مەعنەوی دەتوانێت مرۆڤ بگەیەنێتە پلە بەرزەکانی تەریقەت. هەربۆیە بەندەو هاوڕێکانم کە یەکێکیان عادلی برام بوو بڕیارماندا هەموو ڕۆژێك پاش نوێژی عەسر لەخانەقاوە بڕۆین بۆ خزمەتی مامۆستا مەلا ساڵح (بەڕەحمەت بێت) کە زۆربەی کات تەشریفی لەمزگەوتەکەی خۆیدا دادەنیشت کە لەکۆڵانی پشتەوەی خانەقا بوو، هەرکاتێك کە دەچووینە خزمەتی لوتفێکی زۆری لەگەڵماندا دەنواندو هەروەك هاوڕێیەك قسەی لەگەڵ دەکردین، لەڕاستیدا سوودێکی ڕۆحی باشمان لەخزمەتیدا وەردەگرت وەئەو زاتە چرایەك بوو بۆ باوەڕداران.

مامۆستا مەلا ساڵح (بەڕەحمەت بێت) لەپاش تەدریسی ڕۆژانە زۆربەی کاتەکان مەشغوڵی موراقەبەی مەعنەوی دەبوو وەهەرکات میوانی بهاتایە ئەوا مەجلیسی هەمیشە گەرم بوو بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی پیاوچاکان و باسی ڕابردووی زاناو مەشایخەکانەوە کە بۆ ئێمە لەوتەمەنەدا بیستنی ئەو باسانە زۆر سەرسوڕهێنەرو گرنگ بوون.

ڕۆژێکیان چووینە خزمەتی لەپاش بەخێرهاتن و دەربڕینی مەحەبەت و لوتفێکی زۆری لە بەرامبەرماندا کۆمەڵێك زاناو پیاوماقوڵی شارەزور هاتنە خزمەتی، بەندە تەنها مەرحومی مامۆستا مەلا محمد ئەمینی تەپەکەلیم لەناویاندا دەناسی کە یەکێك بوو لەڕیش سپییەکانی ناوچەکە هەروەها وەکیلی حەزرەتی شێخ ئەحمەدیش (قدس سره) بوو بۆ سەرپەرشتی زەویەکانی تەپەکەل، پاشان هەندێك گفتوگۆیان لەگەڵ مامۆستادا کردو دواتر مەلا محمد ئەمین (بەڕەحمەت بێت) لەجەنابی مامۆستای پرسی قوربان جەنابت پێشتر مەلاو مودەڕیسی گوندی تریفە بوویت هۆی چی بوو کەوا تەشریفت هێنا بۆ هەڵەبجەو لێرەدا نیشتەجێ بوویت؟

لەوەڵامدا فەرمووی جارێکیان لەخزمەت حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سره) ڕۆیشتین بۆ گوندی هانەسورە بەمەبەستی سەرەخۆشی لەساداتی ئەو گوندە کە خزمو کەسی ئەو حەزرەتە بوون لەکاتی گەڕانەوەماندا گەیشتینە ئەم بەشەی شاری هەڵەبجە کە (ئەوکات پێی دەوترا مۆردانە و ئێستاش پێی دەوترێت کانی عاشقان) وەلەم ڕێگەیەی کە بەبەردەم ئەم مزگەوتەدا تێدەپەڕێت دەڕۆیشتین لەناکاو حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) بۆماوەیەك ڕاوەستاو بەمەبەستی موراقەبەی مەعنەوی چاوی نابەیەکدا پاشان چاوی موبارەکی بەرزکردەوەو فەرمووی بابڕۆین منیش لە ئەسپەکەم هاتمە خوارەوەو هەوساری ئەسپەکەی ئەو حەزرەتەم گرت بەدەستمەوەو عەرزم کرد ئێستاو لەم شوێنەدا گونجاونیە بۆ موراقەبەی مەعنەوی ئەگەر شتێکی زۆر گرنگ ڕووی نەدابێت یا دەبێت هەرلەم شوێنەدا هۆکاری ئەم موراقەبەیە بزانم یا نارۆمو هەوساری ئەسپەکەش بەرنادەم، ئەو حەزرەتەش لەوەڵامدا فەرمووی گوێم لەدەنگی زیکرو تەهلیلە بوو لەم دەوروبەرەدا وویستم بزانم ئەو کەسانە کێن کەلەم چۆڵەوانیەدا زیکری خودا دەکەن هەربۆیە بەهۆی ئەو موراقەبەوە خودای مەزن بۆی

ئاشکرا کردم کە ئەولادەکانم دێن و ئەم شوێنە ئاوەدان دەکەنەوەو زیکری خودای تیادا ئەنجام دەدەن.

مەرحومی مامۆستا فەرمووی ئیتر لەوکاتەوە بڕیارمدا کەگوندی تریفە بەجێ بهێڵم و لەم شوێنەدا نیشتەجێ بم هەروەها ئەم مزگەوت و حوجرەی فەقێیەم لێرەدا دروست کردو چاوەڕوانی هاتنەدی ئەو خەواریقە بووم، پاش وەفاتی حەزرەتی حسامەدین (قدس سرە) لەساڵدا چەند جارێك دەچووم بۆ گوندی باخەکۆن بۆ زیارەتی مەرقەدو حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سرە) لەیەکێك لەو زیارەتانەمدا هەواڵم پێگەشت کە هەندێك کێشەو ئاژاوە بۆ حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سرە) دروست کراوەو هیچ چارەسەرێکی نیە لەدوای گفتوگۆیەکی زۆر لەگەڵ ئەو حەزرەتەدا بۆئەوەی لەو کێشەیە دەربازی بێت بەڵام نەگەیشتین بەهیچ نەتیجەیەك بێجگەلە کۆچکردنی بۆ شوێنێکی دیکە، لەبەرئەوە من ئامادەیی خۆمم دەربڕی بۆ پشتیوانی و پەنادانی ئەو حەزرەتە لەماڵی خۆمداو ئەویش ئەم ڕەئیەی منی پێ باش بوو بەڵام ئەوەی پێ ڕاگەیاندم کە تاحەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سرە) لەسەر ئەم بڕیارە ڕەزامەندی خۆی نیشان نەدات ئەوا بۆ هیچ شوێنێك کۆچ ناکەم.

مەرحومی مامۆستا فەرمووی پاشان چوومە خزمەت حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم و(قدس سرە) ئەو گفتوگۆو بڕیارەم عەرزکردو ئەویش فەرمووی مەلا ساڵح برا خۆت دەزانیت لەئێستادا ئەرکو بەرپرسیاریەتی من چەند سەخت و گرانە وەئەو کێشەیەی کە ڕووبەڕوی شێخ ئەحمەدی کوڕم بووەتەوە هەمان کێشەش بۆمن دروست کراوە جالەبەرئەوە تۆ ڕادەسپێرم کە لەمەودوا ئەرکی باوکیەتی بەرامبەر بە شێخ ئەحمەد بگریتە ئەستۆ چونکە ئومێدی من و حەزرەتی حسامەدینە (قدس سرە) نامەوێت لەناوبچێت. منیش عەرزم کرد

ئەوەی لەتوانامدابێت دەیکەم بۆ پشتیوانی و هاوکاری حەزرەتی شێخ ئەحمەدی کوڕت (قدس سره)، ئەوەبوو هەرئەو ڕۆژە ئەو حەزرەتە لەباخەکۆنەوە کۆچی کردو تەشریفی هێنا بۆهەڵەبجە.

حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بۆ بەندەی گێڕایەوەو فەرمووی ئەوکاتەی کە کۆچم کرد بۆ هەڵەبجە ناومالّم بریتی بوو لە دوو دەستە جێگەوبان و فەرشێکو میقدارێکی کەم قاپو قاجاغ، وەجەنابی مامۆستا مەلا سالّح ژورێکی بۆ ئامادەکردم و فەرمووی لەئێستا بەدواوە ئەم ژوورە

خانەقای جەنابتە هەربەوشێوە بۆ ماوەیەك لەوژوورەدا دەژیام وەموریدو مەنسوبی ناوچەکانی گەرمیان و شارەزورو ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەهاتن بۆ سەردان و زیارەت وەمنیش هەرلەو ژوورەدا پێشوازیم لێ دەکردن و خواردن و خەوتنمان پێکەوەبوو.

پاشان دەنگوباسی چۆنیەتی ژیانی من گەیشت بەهەندێك لە موریدە دڵسۆزو دەستودڵ فراوانەکانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) هەربۆیە ئەوانیش یەکسەر هاتن بۆ سەردانمو ئیسرارێکی زۆریان لێ کردم کە بەهاوکاری ئەوان لەم ناوچەیەدا زەویەك بسێنم و خانەقاو مالّی تیادا دروست بکەم. پاشان چووم لەگەڵ مامۆستادا لەوبارەیەوە ڕاوێژم کرد ئەویش ئەم کارەی پێ باش بوو وەفەرمووی ئەو زەویەی بەرامبەرمان موڵکی فاتمە خانی تایەر بەگی جافە هەروەها مەرحومی باوکی پەیوەندیەکی باشی هەبووە لەگەڵ حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سره)، لەبەرئەوە هەوالّی بۆ بنێرە ئەگەر ئەو زەویە دەفرۆشێت ئەوا جەنابت مشتەریت. حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) فەرمووی پاش ئەوەی کە هەواڵەکەم بۆ نارد ئەو خانمە بەڕێزە بەئەو پەڕی بەخشندەیی و هیمەت بەرزیەوە وەڵامی دایەوەو ووتبووی بەشێك لەو زەویە دەبەخشم بەخانەقای شێخ ئەحمەدو پارەکەی وەرناگرم وەتەنها پارەی بەشە

خانوەکەی لێ وەردەگرم.

بەوشێوەیە خانەقای حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامی لەبەرواری (١٣٧٩)ی کۆچی بەرامبەر بە (١٩٤٨)ی زاینی دروست کرا، هەر لەوبارەیەوە جەنابی مەلا عەلی چنار ئەم دوو بەیتەی نووسیوە:

خانەقای هەیە وا لە هەڵەبجە      ئەحمەد حیسامی زاتێکی گەنجە

خودا بیپارێزێت لە دەردو ئەلەم      تا بیکات ئیرشاد لەناوی عالەم

❊ ❊ ❊

## ( ئیرشادی یەکەمی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئەو پیلانانەی کە لە پاش ئەو ئیرشادە لەدژی ئەنجامیاندا )

ئەگەر خودای مەزن بیەوێت یەکێك لەبەندە خۆشەویستەکانی هەڵبژێرێت و هەندێك سیفاتی تایبەتی پێ ببەخشێت بۆئەوەی بەباشترین شێوە سوود بە مرۆڤەکانی دیکە بگەیەنێت ئەوا بەهۆی هەندێك سەختی و کێشەوە کە لەلایەن ناحەزانیەوە ڕووبەڕوی دەبێتەوە ئەو بەندەیەی خۆی دەگەیەنێت بەو پلە بەرزەو هەروەها لەکارەکەیدا زیاتر ئەزمون و کارامەیی بەدەست دەهێنێت، هەر لەم بارەیەوە پەندێکی فارسی هەیە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

(دشمن شود سبب خیر اگر خدا خواهد)

واتە: ئەگەر خودا بیەوێت دوژمن دەبێت بە هۆکاری سوود گەیاندن بە مرۆڤ.

هەروەها حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) یەکێك بوو لەو ئەولیا مەزنانەی کە زۆر جار ناحەزان بە ئەنجامدانی ئەو پیلانانەی کە دژی ئاین و تەریقەتن هەوڵیان دەدا بەربەست و ڕێگری لەبەردەم پیشەو ئەرکەکانی ئەو حەزرەتەدا دروست بکەن بەڵام ویستی خودای تعالی بەوجۆرە بوو کە لەبری سەرکەوتنی ئەو بێباوەڕانە بۆ گەیشتن بەئامانجەکانیان بەپێچەوانەوە گەشەسەندن و خۆشەویستی ئەو حەزرەتە لەناو ناخی موریدو دۆستەکانیدا زیادی دەکرد وەلەڕووی کارە دینی و دنیایەکانیەوە زیاتر سەرکەوتنی بۆ مسۆگەر دەبوو هەروەها بە ئەوپەڕی لوتفو لێبوردەیشەوە لەگەڵ ئەو ناحەزانەیدا هەڵسوکەوتی دەکرد وەئەم کارەش تەنها لە پیاوچاکان دەوەشێتەوە.

لەوبارەیەوە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوەو فەرمووی لەدوای تەواوبون و دروستکردنی خانەقاو ڕاپەڕاندنی ئیشوکارەکان زۆرێك لە موریدەکانی

شارەزورو گەرمیان و ناوچەکانی دیکەی وەك باکورو ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەهاتن بۆ هەڵبجە بەمەبەستی زیارەت بەوهۆیەوە دووبارە ڕێبازی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لە ترۆقەو گەشەسەندندا بوو بەتایبەت موریدو مەنسوبانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەکاتی سەردانیاندا زۆر ئاواتە خواز بوون کە بەمەبەستی ئیرشاد سەردانیان بکەم وەلەوبارەیەوە دەعوەتیان دەکردم، ئەو حەزرەتە فەرمووی لەپاش ماوەیەك هەواڵم نارد بۆ موریدەکانی ناوچەی هەورامان کە ئامادەبن بۆ ئەو مەبەستە ئەوەبوو لەزوستانی هەمان ساڵدا بەڕێ کەوتین بۆ ئیرشادی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و بۆماوەی سێ مانگ لەوناوچەیەدا سەردان و ئیرشادمان ئەنجامدا کە بەوهۆیەوە خەڵکانێکی زۆر هاتنە ناو ڕێبازی حسامی نەقشبەندیەوە کە پێشتر بەهیچ جۆرێك ئاگایان لەو بیروباوەڕو بەرنامەیە نەبوو سەرەتا لەناوچەی ژاوەرۆی سەر بەپارێزگای سنە دەست بەکاربوین پاش یەك مانگ بەڕێکەوتین بۆ ناوچەی لەیلاخی سەر بەهەمان پارێزگا لەوێش بۆ ماوەی مانگێك ئیرشادمان کرد پاشان چووین بۆ ناوچەکانی سەقزو بۆکان وسابلاغ، بەوشێوە تاتەواوبونی سێ مانگەکە پاشان کۆتایمان هێنا بەئیرشادیەکەو گەڕاینەوە بۆ خانەقای هەڵبجە.

بەندە لێرەدا بەپێویستی دەزانم باسی ئەو ڕیوایەتەی حاجی قادری هەجیجی بکەم کە موریدێکی بەوەفاو قەدیمی ئەو حەزرەتەیەو هەروەها مرۆڤێکی بەدین و ڕاستگۆیە، لەبەرئەوەی هەندێك لە بێباوەڕان و ناحەزانی ئەو حەزرەتە چەند چەواشەکاریەکیان لەبارەی ئیرشادەکەی شاری بۆکان و سابلاغەوە بلاوکردبویەوە کە (گوایە ئەو حەزرەتە بەهۆی ژن و ژنخوازیەوە ڕێگەی پێدراوەو توانیویەتی ئیرشاد لەوناوچانەدا ئەنجام بدات) بەڵام ئەم ووتەیە بێ بنەمایەو دورە لەڕاستیەوە چونکە ئەو حەزرەتە لەپێش ئەو ئیرشادەدا ژنی نەهێناوەو هەروەها لەپاش کۆچی دوایی خێزانی یەکەمیشی بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە هیچ لایەنێك

چەند ئیرشادیەکی دیکەشی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا ئەنجامـداوە، هەربۆیـە بـەم ڕیوایەتـە ئەو ناڕاستیانە بۆ هـەموو موریـدو دۆسـتەکانی ڕێبـازی حـەزرەتی حسـامەدین (قـدس سـره) ئاشکرا دەبێت کە ئەمەش دەقی ڕیوایەتەکەیە:

((حاجی قادر ووتی کاتێك ئیرشادی ئەو حەزرەتە گەیشتە ناوچەی بۆکان وسابلاغ من لە خزمەتیدا بووم وەبۆماوەی چەند ڕۆژێك لەگوندی زەنبیلدا ماینەوەو میوانی ساداتی ئەو گوندە بووین کە سەید عـبدالکریمی (قدس سره) باپیریان خەلیفەو زاوای حـەزرەتی سـراجەدین و بەهائەدین بوو (قدس سرهما) هەروەها خـاڵۆی حـەزرەتی حسـامەدین بـوو (قـدس سـره)وەلـەو حەزرەتەیان بیستووە کاتێك وەسـفی خـاڵۆی دەکـرد دەیفـەرموو (شـانازی مـن ئەوەیـە کـە لەگەڵ ئەوەی سید عـبدالکریم خاڵۆمە خەلافەت و تەریقەتیشی لای من تازە کردوەتەوە).

جەنابی شێخ موعـتەسەمی کوڕی پێنجەمی حەزرەتی حسامەدین (قـدس سـره) لـەحاڵی حەیاتی ئەو حەزرەتەدا کچێکی لە ساداتی زەنبیل خواستبوو کـە کچـێکی لـەو ژنەیـە بـوو بەناوی مریەم خان (بەڕەحمەت بێت) وەپاش لەدایك بوونی مریم خان ئەو ژنەی شێخ موعتەسەم وەفات دەکات (بەڕەحمـەت بـن) ئـیتر لەوکاتـەوە سەرپەرشـتی و بـژێوی مریـەم خـان دەکەوێتـە ئەستۆی ساداتی زەنبیل و لەلای ئـەوان بـەخێو دەکرێـت. لەوماوەیـەی کـە ئێمـە لـەزەنبیل میوان بووین لەلایەن ساداتی ئەو گوندەوە پێشنیاری خواستنی مریـەم خـان بـۆ حـەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) کرا، وەعەرزیان کرد قوربان مریەم خان ئامـۆزاتەو کچەزای ئێمەشـە هەربۆیە ئێمە زۆر دڵخۆش دەبین کە جەنابت بیخوازیت و ئەو خزمایەتیەمان زیاترو پتـەوتر بێـت، ئەوحەزرەتـەش فـەرمووی مریـەم خـانی ئـامۆزام بـە شـەرع وعـورف جـەنابی شـێخ موعـتەسەمی مـامم سەرپەرشـتیەتی وەتـا ئـەو ڕەزامەنـدی پیشـان نـەدات و ئیجـازەی لێ وەرنـەگیرێت ئـەوا ئـەوەی کـە ئێـوە شـادمان ئـەکات و منـیش لاریـم تێدانیـە نایەتـەجێ

بەوهۆیەوە لەهەمان ڕۆژدا ساداتی زەنبیل کەسێك وەك نامەبەر دەنێرنە خزمەت جەنابیان کە تەشریفی لەشاری سنە نیشتەجێ بوو پاشان وەڵامی ئەرێنی جەنابیان گەیشتە دەست ساداتی زەنبیل و بەمەش مەراسیمی مارەبڕین و داخوازی ئەنجامدرا)).

هەرلەو سەردەمەدا هەندێك گۆڕانکاری لەعێراقدا ڕوویدا وەك ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و هاتنە سەر دەسەڵاتی بێباوەڕان کە بووە هۆی ئازارو دەربەدەری زۆرێك لەمەشایخ و زانا ئاینیەکان. حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بۆی گێڕامەوەو فەرمووی کاتێك کە حزبی شیوعی هاتەسەر حوکم زۆر ستەمیان لەمورشیدەکانی تەریقەت دەکرد وەهەمیشە هەوڵیان دەدا کە بیانخەنە ناو تەنگو چەڵەمەوە هەروەها بوبون بەبەربەست لەبەردەم ئیرشادو خزمەتەکانیان بەرامبەر بەخەڵك تا کاریان گەیشتە ئەو ڕادەیەی کەهەندێك لەو مەشایخانە باشوری کوردستان بەجێ بهێڵن و لە ڕۆژهەڵات جێگیر بن وەیەکێك لەو مەشایخانەش حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم بوو (قدس سره) کە ئەو کۆچکردنەش بووە هۆی دروستکردنی فشاری زیاتر لەلایەن بێباوەڕانەوە دژ بەمن.

هەروەها بەهۆی ئەو هەموو ئیرشادو خزمەتە مەزنانەی کە من بەخەڵك و ڕێبازی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) گەیاندبوم ئەوان زۆرتر قەڵس دەبوونو بەهەموو شێوەیەك هەوڵیان دەدا کەلەم ئەرك و بەرپرسیاریەتیە دوورم بخەنەوە ئەمەش بەمەبەستی لەناوبردنی ئاین و ڕێبازەکانی.

هەربۆیە یەکەم کارێك کە بۆ ئەو مەبەستە ئەنجامیاندا قایمقامێکی بێ باوەڕی دژ بەهەموو بەها مرۆیی و ئاینیەکانیان بۆ هەڵەبجە دەست نیشان کرد وەگرنگترین ئەرکێك کە پێیان سپاردبوو دەرکردنی فەرمانی بەسەرباز کردنی من بوو، لەحاڵێکدا قانونی عێراقی ئەوکات لێبووردنی بۆ ئەو کەسانە دەرکردبوو کە ئەرکی ئیرشادو تەریقەتیان

لەئەستۆیە بەڵام ئەو بێباوەڕانە پیلانێکی ئەوەنـدە خراپیـان دژ بـەمن دارشـتبوو بـەجۆرێك کەئەو لێبوردنە من نەگرێتەوە ئەوەبوو ڕۆژێکیان چەند پۆلیسێك هاتنە بەردەرگای خانەقاو فەرمانی قایمقامیان بۆ ئەو مەبەستە پـێ ڕاگەیانـدم کاتێـك گەیشـتینە لای قایمقـام بـەبێ وچان فەرمانی کرد بە پۆلیسەکان و یەکسـەر پۆشـاکی سـەربازیان لەبـەرکردم و بردمیـان بۆلای قازی ئەو وەختە کە لەسلێمانی دەوامـی دەکـرد ، حـەزرەتی شـێخ ئەحمـەد (قدس سره) فەرمووی ئەو قایمقامە زۆر حەریس بوو لەسەر ئەوکارە کە بـەزووترین کـات ئـەنجام بـدرێت بەشێوەیەك کە خودی خۆی لەگەڵمدا هات بۆلای قازی و دەستی لەقۆڵم بەرنەئـەدا دەترسـا لەوەی کە لێی وونبم یا بگەڕێمەوە بۆ خانەقاو سەربازیەکە ئەنجام نەدەم، خۆشبەختانە قـازی ئـەوکات جـەنابی شـێخ محمـدی خـاڵ[٢٣] بـوو کـە چـووینە خزمـەتی جـەنابیان کتێبـی دەخوێندەوەو سەری بەرز نەکردەوە تامن ببینێت لەوکاتەدا قایمقام فـەرمانی سـەربازیەکەی منی خستە بەردەمی کە شێخی خاڵ سـەری بـەرزکردەوەو چـاوی کـەوت بـەمن لەپۆشـاکی سەربازیدا ڕەنگی ڕوخساری تێکچوو دیاربوو زۆر پێی ناخۆش بوو کە بەوشێوە منی بینـی پاشان لەقایمقامی پرسی ئەمە چیە؟

لەوەڵامـدا ووتی جەنابی قازی ئـەم شەخسـە دەبێـت ئـەرکی سـەربازی ئـەنجام بـدات و ئەوەش فەرمانی سەربازیەکەیەتی کە دەبێت جەنابت واژووی لەسەر بکەیت (لـەقانونی ئـەو سەردەمەی حوکمەتدا فەرمانی سەربازی بەبێ واژووی قازی کاری پێ نـەدەکرا). لەوکاتـەدا قازی خاڵ بەتوڕەییەوە ڕووی کردە قایمقام و فـەرمووی لـەو مـەنجەنیقـە گەورەیـەی حـەزرەتی

---

[٢٣] قازی خاڵ نەوەی شێخ ئەمینی خاڵە (قدس سرهما) کە خەلیفەی حەزرەتی بەهائەدینی یەکەم بووە وەخودی شێخ محمدی خاڵیش لەساڵەکانی دوایی تەمەنی حەزرەتی حسامەدیندا لەخزمـەتیدا تەمەسـوکی تەریقەت و خەلافەت وەردەگرێت (قدس الله اسرارهم) ......................... نووسەر.

**حسامەدین** (قدس سره) **تەنها ئەم مۆمەتان هێشتبوویەوە ئێستا دەتانەوێت ئەمەش خامۆش بکەن، نەکەن هەڵەی وەها ئەنجام بدەن چونکە ئەو بەردەی پشت سەرت لەدیوارەکە دەردەچێت و مێشکت لە دەمو لووتتەوە دەپژێنێت. وەمنیش بەهیچ شێوەیەك ئەو فەرمانە واژوو ناکەم، لەوکاتەدا قایمقام لە قازی خاڵی پرسی جەنابت بە چ یاسایەك ئەو فەرمانە واژوو ناکەیت؟**

**لەوەڵامدا فەرمووی جەنابی شێخ ئەحمەد برای دایك و باوکی نیە هەروەها برا گەورەکەی بەناوی شێخ مەحمود** (بەرەحمەت بێت) **لەتەمەنی لاویەتیدا کۆچی دوایی کردوەو ئێستا جەنابی شێخ ئەحمەد قەیومی دایکیەتی وەلەقانونی عێراقیدا قەیوم سەربازیی پێ ناکرێت بۆیە ئەو فەرمانەی کە تۆ هێناوتە کاری پێناکرێت. بەوشێوە جەنابی شێخ محمدی خاڵ لە پیلانی بێ باوەڕان ڕزگاری کردم (خودا پاداشتی بەباشترین شێوە بداتەوە).**

**حەزرەتی شێخ ئەحمەد** (قدس سره) **زۆربەی کات کە باسی مامۆستا شێخ محمدی خاڵی** (بەرەحمەت بێت) **دەکرد ڕێزو وەفایەکی تایبەتی بۆ دەردەبڕی وەهەرکات تەشریفی ببردایە بۆ شاری سلێمانی بەگوێرەی مەجال سەردانی دەکرد ، جارێکیان لە خزمەت ئەو حەزرەتەدا چووم بۆ سلێمانی لەکاتی گەڕانەوەدا بەشۆفێرەکەی فەرموو بڕۆ بۆ ماڵی شێخی خاڵ دەمەوێت زیارەتێکی بکەم کاتێك گەشتینە بەردەم ماڵەکەیان فەرمووی ئێوە دامەبەزن بازۆر دوانەکەوین من زۆرم پێناچێت و زوو دەگەڕێمەوە لەپاش چوار بۆ پێنج خولەك کە لەخزمەتیدا بوو ئینجا تەشریفی هاتەوەو بەرەو هەڵەبجە بەڕێ کەوتین.**

## وێنەی ژمارە: (١٢)



(جەنابی شێخ مەحمودی حسامی (بەڕەحمەت بێت))

## وێنەی ژمارە: (١٣)



(کۆمەڵێك زانای ئاینی لەخزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەددا (قدس سره) لەکاتی زیارەتی مەرقەدی حەزرەتی کاکە ئەحمەدی شێخ (قدس سره) ئەم وێنەیە گیراوە).

١. لەلای ڕاستەوە مامۆستا شێخ محمدی خاڵ (بەڕەحمەت بێت).

٢. لەناوەڕاستدا مامۆستا مەلا ساڵحی تریفە (بەڕەحمەت بێت).

٣. حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره).

٤. لەپشت سەری ئەو حەزرەتەوە دکتۆر ئەحمەد عبدالستار الجواری وەزیری ئەوکاتەی ئەوقاف وکاروباری ئاینی.

## (کۆچی یەکەمی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان)

لەپاش هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولی (١٩٦١)و ڕوودانی جەنگ لەنێوان ڕژێمی ئەوکاتەی عێراق و پێشمەرگەدا ئەوەبوو کە ئەو جەنگە زۆربەی ناوچەکانی باشووری کوردستانی گرتەوە وەفەرماندەی ئەو لەشکرەی کە بەرەو پارێزگای سلێمانی بەڕێ کەوتبوو (زەعیم سدیق) بوو کە ناوبانگی دەرکردبوو بەخوێن ڕێژو ستەمکار بەرامبەر بەگەلی کورد بەوجۆرەی کە من بیستبووم زۆربەی ئەو پێشمەرگانەی کە بەدیل دەکەوتنە بەردەستی یەکسەر گولەبارانی دەکردن.

کاتێك ئەو لەشکرە دەگەنە ناوچەی شارەزورو هەورامان بەکرێ گیراوانی خۆفرۆش و دژ بەئاین یەکسەر دەچن بۆلای زەعیم سدیق و هەندێك ڕاپۆرت دەخەنە بەردەستی دژ بە زانا ئاینیەکان و مەشایخی ناوچەکە کەوا ئەم کۆمەڵە هاوکاری پێشمەرگەو شۆڕشی مەلا مستەفا (بەڕەحمەت بێت) دەکەن وەهاندەرو بزوێنەری ئەم کۆمەڵە زاناو مەشایخانەش حەزرەتی شێخ ئەحمەدە (قدس سره) کە ئەگەر ئەو دەستگیر بکرێت و لەناوبچێت ئەوا ئەوانەی دیکە ناتوانن هیچ جۆرە زیانێك بەڕژێم و حزبی شیوعی عێراق بگەیەنن، هەربەوهۆیەوە زەعیم سدیق فەرمانی دەستگیر کردنی ئەو حەزرەتە بەزیندویی یا بەشەهیدکراوی دەردەکات.

حاجی باوەمورادی بێسارانی (بەڕەحمەت بێت) کەیەکێك بوو لەموریدە بەوەفاکانی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بۆی گێڕامەوەو ووتی لەپاش بڵاوبوونەوەی هەواڵی دەرچونی بڕیاری دەستگیر کردنی ئەو حەزرەتە لەلایەن زەعیم سدیقەوە چوومە خزمەتی و عەرزم کرد قوربان دەنگوباسی ئەوە بڵاوبوەتەوە لەناو خەڵکدا کەوا سوپای عێراق فەرمانی دەستگیر کردنی جەنابتیان پێدراوە لەلایەن زەعیم سدیقەوە بەشێوەیەك ئەگەر بەزیندووی نەیانتوانی ئەو کارە ئەنجام بدەن ئەوا ڕێگە پێدراون کە تەقەت لێ بکەن و شەهیدت بکەن

هەربۆیە مانەوەت لەهەڵەبجەدا مەترسیدارە، لەوەڵامدا فەرمووی برا من بەتەنها بۆ خۆم ناژیم وەهیچ کات باوەڕم بەوەنیە کە خۆم دەرباز بکەم تاوەکو لە ئارامیدا بژیم و موریدو دۆستەکانیشم لەئازارو مەینەتیدا بەجێ بهێڵم هەرکات زانیم بوونی من لێرەدا دەبێتە کێشە بۆ ئەوان ئەوا ئەوکاتە مشوری خۆم دەخۆم هەروەها پێشتر ئەو هەواڵەم پێگەشتبوو بەڵام تائەو کاتەی دڵنیابم لەوەی کە بوونم لەباشوری کوردستاندا دەبێتە هۆی شادمانی و ورەبەرزی خەڵکی ئەم ناوچەیەو دۆستەکانم ئەوا تامردن ئێرە بەجێ ناهێڵم وەبەردیش لە شوێنی خۆی سەنگینە.

حاجی باوە موراد (بەڕەحمەت بێت) ووتی پاش چەند ڕۆژێك لە بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە یەکێك لەو کەسە دڵسۆزو بەوەفایانەی ئەو حەزرەتە کە لەهەمان کاتدا پەیوەندی هەبوو لەگەڵ هەندێك کاربەدەستی ڕژێمی ئەوکاتدا بەنهێنی هاتە خزمەتی و عەرزی کرد ڕژێم بڕیاری داوە تاقمێك سەرباز بەچاوساغی بەکرێ گیراوانی بدەن بەسەر خانەقاداو جەنابت دەستگیر بکەن، لەپاش بیستنی ئەو هەواڵە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) هەموو ئەهلی خانەقای کۆکردەوەو فەرمووی بەهۆی ئەوەی کە ڕژێم بەنیازە ئیمشەو سەربازو بەکرێ گیراوەکانی بنێرێت بۆ ئێرە تاوەکو من دەستگیر بکەن هەربۆیە من نامەوێت ئێوە بخەمە ناو ئازارو کێشەوە لەبەرئەوە بڕیارمداوە بۆ ماوەیەك لێرە دووربکەومەوەو بڕۆم بۆ شوێنێکی دیکە تائەم دەنگوباسە نامێنێت پاشان دەگەڕێمەوە هەروەها بێجگەلە باوەمورادو سۆفی ڕەشید[٢٤] کەسی دیکە لەگەڵ خۆمدا نابەم ئێوەش هەرکامتان

---

[٢٤] سۆفی ڕەشید (بەڕەحمەت بێت) خەڵکی گوندی قشڵاخە ڕووتەی سەر بە ناوچەی شارەزور بوو وەیەکێك بوو لە موریدە قەدیمیەکانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) کە زۆربەی کات لەحاڵەتی موراقەبەو جەزبەدا بوو .................. نووسەر.

بەرگەی ئەم بارودۆخە ناگرن سەرپشکبن لەمانەوە یاخود بەجێهێشتنی خانەقا.

پاشان هەندێك كەلوپەل و ئازوقەی سەفەرمان ئامادەكردو لە خزمەت ئەو حەزرەتەدا بەڕێ كەوتین تائەوەی كە لەشار دەرچوین لەوكاتەدا عەرزم كرد قوربان چ شوێنێكت دیاری كردوە كە خۆمانی تیادا حەشار بدەین وەئێستا بەرەوكوێ دەڕۆین فەرمووی دەڕۆین بۆ گوندی (دۆڵاش)و دەبین بە میوانی حاجی محمد[٢٥] چونكە ئەوێ كەنارەو لەوانەیە كەس نەماندۆزێتەوە هەتا چەند ڕۆژێك لەوێ دەبین و دواتر دەگەڕێینەوە، حاجی باوەموراد ووتی لەڕێگەدا شەومان بەسەردا هاتوو بەردەوام بووین لەڕۆیشتن تاوەكو گەیشتینە شوێنێك لە نزیك شارۆچكەی سەیدسادق وەلەو شوێنەدا عەشیرەتی گەڵاڵی كە ئەوكات كۆچەری بوون و گەرمیان و كوێستانیان دەكرد خەیمەیان هەڵدابوو وەهەندێك سەگی دڕیان بۆ پاسەوانی لەخۆیان و ئاژەڵەكانیان ڕاگرتبوو كاتێك نزیك بووینەوە لە خەیمەكان سۆفی ڕەشید لەبەر خۆیەوە دەیگووت خودایە لەبەرخاتری حەزرەتی حسامەدین (قدس سرە) ئەو سەگانە لێمان نەوەڕن تاوەكو لەم شوێنە تێدەپەڕین هۆی ئەو نزاو ترسەی سۆفی ڕەشید ئەوەبوو كە ڕژێمی ئەوكات جاش و جەیشێكی زۆری لەناوچەكەدا بڵاوكردبویەوە دژ بەهێزی پێشمەرگە وەلەهەرشوێنێكدا هەستیان بە جموجۆڵ بكردایە دەستبەجێ بەرەو ئەو شوێنە بەڕێ دەكەوتن، خودا دۆعاو پاڕانەوەكەی قەبوڵ كردو بەزەیی هاتەوە بەئێمەداو لەوشوێنە ڕزگارمان بوو بەبێ ئەوەی یەك سەگ نوزەی لێوەبێت.

---

[٢٥] حاجی محمد دۆڵاشی (بەڕەحمەت بێت) ڕیش سپی عەشرەتی بلباس بوو وەمرۆڤێكی بەدەسەڵات بوو هەروەها یەكێك بوو لە موریدە خۆشەویستەكانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سرە) ........................ نووسەر.

لەدوای گەیشتنمان بەگوندی دۆڵاش بۆ ماوەیەك لەماڵی حاجی محمد پشوماندا پاشان حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) فەرمووی باوەموراد و سۆفی ڕەشید برا ئێوە بەڕێکەون بەرەو گوندی باخەکۆن وەهەواڵی چۆنیەتی وەزعی دانیشتوانەکەی و کەسوکارەکەم بزانن دوای چەند ڕۆژێکی تر منیش دەگەڕێمەوە بۆ هەڵەبجە، فەرمانەکەیمان ئەنجامداو بۆ سەرلەبەیانی لەگوندی دۆڵاشەوە بەڕێکەوتین بەرەو باخەکۆن وەبۆماوەی چەند ڕۆژێك لەوگوندە ماینەوە لەوماوەیەدا هەواڵمان پێگەیشت کەوا زەعیم سدیق فەوجێك جاشو سەربازی ناردوە بۆ گوندی دۆڵاش بۆئەوەی ئەوحەزرەتە دەستگیر بکەن بەڵام نەیاندۆزیوەتەوە بەوهۆیەوە گوندەکەیان سووتاندوە لەگەڵ گەیشتنی ئەو هەواڵەدا غەمو بێ تاقەتیەکی زۆر ڕووی تێکردم وەئۆقرەم لێ هەڵگیراو یەکسەر بەڕێ کەوتم بەرەو هەڵەبجە بۆئەوەی هەواڵی ڕاست و فەوریم لەوبارەیەوە دەستبکەوێت لەڕێگەدا فڕۆکەکانی ڕژێم لەئاسمانەوە هەندێك بەیاننامەیان خستە خوارەوە بەیاننامەیەکم هەڵگرت و کاتێك گەیشتمە ناو شار چاوم بەکۆمەڵێك خوێندەوار کەوت و پێم ووتن ئەم بەیاننامەم لە دەرەوەی شار دۆزیوەتەوە ئەگەر بۆم بخوێننەوە سوپاستان دەکەم بەیاننامەکەیان بۆ خوێندمەوە کە بەکورتی ئەمەی تێدا نووسرابوو (بەهۆی ئەوەی کە شێخ ئەحمەدی حسامی هاوکای و پاڵپشتی پێشمەرگە دەکات ئەوا هەرکەس حەشارگەکەی بزانێت و بەحکومەتی ڕابگەیەنێت بەباشترین شێوە پاداشتی دەکەین) وەلەکۆتایەکەیدا مەبلەغێك پارە بۆئەو مەبەستە نووسرابوو وەك پاداشتێك بۆ ئەو کەسانەی کە زانیاریان پێدەدەن،

حاجی باوەموراد (بەڕەحمەت بێت) ووتی پاش بیستنی ئەو هەواڵە تائەندازەیەك ئارامی ڕووی تێکردم و لەدڵی خۆمدا دەمووت شوکر بۆ خودا حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) تائێستا لەلایەن ڕژێمەوە دەستگیر نەکراوە، بەڵام هێشتا دڵەڕاوکێ و خەفەتەکەم مابوو

لەبەرئەوەی نەمدەزانی ئەو حەزرەتە لـەکوێ خـۆی حەشـارداوە وەهـەتاوەکو نەگەشـتمایەتەوە خزمەتی بەتەواوی دڵم ئارامی نەدەگرت. هەربۆیە بەرەو خانەقا بەڕێ کـەوتم و کاتێـك لێـی نزیك بومـەوە بڕیارمدا پێش چوونەوە ژوورەوەم تەماشـایەکی دەوروپشـتی گەڕەکەکـە بکـەم نەوەك جاشو جەیش چاودێری خانەقا بکەن پاش دڵنیابوونم لەئارامی ناوچـەکە چـوومە نـاو خانەقاوە بەڵام کەسی تێدا نەمابوو بێجگەلە سۆفی ساڵحی موکریـانی وەهـەموو ئـەوانیتر خانەقایان بەجێ هێشتبوو، پاش پشودانم لێم پرسی دوای ڕۆیشتنی ئێمە لێرە چی ڕوویدا؟

لەوەڵامدا ووتی ئەو شەوە جاشو سەربازەکانی ڕژێم هاتنـە نـاو خانـەقاوە زۆرگـەڕان و جێگەوبان و تفاقیان تێکـدا بەسـەریەکدا کاتێـك نائومێـد بـوون لەدەسـتگیر کردنـی ئـەو حەزرەتە لەمـنیان پرسی تاشوێنەکەی ئاشکرا بکەم منیش ئەوەی ڕاستی بوو پێم ووتن کەوا لێرە نەماوەو تەشریفی بردوە بۆ شوێنێکی نادیار ئیتر خانەقایان بەجێ هێشـت و ڕۆیشـتن. پاشان لێم پرسی هیچ هـەواڵێکت پـێ نەگەیشـتوە لـەو حەزرەتـەوە؟ بەهێواشـی پێـی ووتم ڕۆژێك دوای دەرچونەکەتان گەڕایەوەو هەندێك کەلوپەل و ئازوقەم بـۆ ئامـادەکردو لـەکاتی تەشریف بردنیدا فەرمووی ئەگەر باوەموراد گەڕایەوە پێی بڵێ من لەگوڵانم بابێت بۆ ئەوێ بەبیستنی ئـەم هەواڵـە زۆر شـادمان بـووم و یەکسـەر بـەڕێ کـەوتم تاگەیشـتمە گوڵـان بـۆ ماوەیەك گەڕام بەشوێنیدا پاشان گەیشتمە خزمەتی و دەستیم زیارەت کـرد وەچـاوم پڕبـوو لەفرمێسـك و عـەرزم کـرد قوربـان ئـیتر بەسـە بالەمـە زیـاتر دەربـەدەر نـەبیت و خـۆت ڕزگاربکە، فەرمووی برا وامزانی مانەوەم باشترە بەڵام ئەوەتا خەریکـە ئـازارو چەرمەسـەری زیاتر ڕوودەکاتە خۆمو موریدەکانم بۆیە ناچارم کۆچ بکەم بەرەو کوردستانی ڕۆژهەڵات.

دواتر لێم پرسی قوربان کاتێك کە گوندی دۆڵاش و مـاڵی حـاجی محمـدیان سـووتاند جـەنابت لـەوێ بوویـت؟ لەوەڵامـدا فـەرمووی لـەپاش دەرچـوونی ئێـوە لـەو گونـدە بـێ

ئۆقرەییەکی زۆر ڕووی تێکردم و سەرزەنشتی خۆمم دەکرد کەوا چۆن ئێوەم ناردەوە بەرەو ئەو کێشەو گیروگرفتانەو ئێستاش من بۆ خۆم بەئارامی پشوو دەدەم بۆیە هەرئەوکاتە ئەو گوندەم بەجیٚ هێشت و گەڕامەوە بۆ هەڵەبجە.

پاشان هەواڵی خێزانی و هەروەها کەسوکاری گوندی باخەکۆنی لیٚ پرسیم؟ عەرزم کرد کە هەموو باش و سەلامەتن، لەدوای گفتوگۆیەکی زۆری نێوانمان فەرمووی من ئیمشەو بەڕیٚ دەکەوم بەرەو باخەکۆن و لەوێشەوە دەڕۆمە کەیمنەو بۆماوەیەك لەو گوندە دەمێنمەوە پاشان دەچمە گوندی خانەگا، تۆش بڕۆ بۆ خزمەتی جەنابی مامۆستا مەلا ساڵح بزانە دەنگوباسی چۆنە لەبەرئەوەی دەزانم ئێستا زۆر خەمی حاڵ و وەزعی منیەتی ئەگەر دڵنیابوویت لەوەی کە خەڵکی سەر بە ڕژێم لەوناوەدا بوونیان نیە ئەوا سڵاوی منی پیٚ بگەیەنەو عەرزی بکە خەفەت نەخوات من لەچنگی ڕژێم دەربازم بووەو گەشتوومەتە ڕۆژهەڵاتی کوردستان پاشان ئاگات لەکاروباری خانەقا بێت هەروەها لەبری من سەردانی حاجی محمدی دۆڵاشی بکەو دڵنەوایی بکە بەهۆی ئەو کارەساتەی کە بەسەریاندا هات، عەرزم کرد قوربان سوێند بەخودا تا دڵنیا نەبم و بەچاوی خۆم جەنابت لەخاکی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا نەبینم بەجێت ناهێڵم پاشان دەگەڕێمەوەو فەرمانەکانت ئەنجام دەدەم، ئەو حەزرەتە هەرچی هەوڵیدا کە ئەو ئەزیەتە بەخۆم نەدەم بەڵام سوودی نەبوو لەبەرئەوەی سوێند هاتبوو بەدەممداو زۆر پەشیمان بووم لەوەی کە جاری پێشوو بەتەنها بەجێم هێشتبوو.

هەرئەو شەوە بەڕێکەوتین و بۆ سەر لەبەیانی گەیشتینە گوندی باخەکۆن وەبۆ ڕۆژی دوایی بەرەو گوندی کەیمنە بەڕێکەوتین دوای گەیشتنمان بەوگوندە ئیتر من بەتەواوی خەمم نەماو بۆ دەمەو ئێوارە گەڕامەوە بەرەو هەڵەبجە بەمەبەستی ئەنجامدانی فەرمانەکانی

حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره). بۆ ڕۆژی دوایی چوومە خزمەت مامۆستا مەلا ساڵح لەوکاتەدا هەندێك لە لایەنگرانی ڕژێم لە خزمەتیدا دانیشتبوون کە چاویان بەمن کەوت یەکسەر پرسیاریان لەبارەی ئەو حەزرەتەو حەشارگەکەیەوە لێکردم؟ لەوەڵامدا ووتم نازانم لەکوێیە هەرکەسەو قسەیەك دەکات هەندێك دەڵێن لەشارەزوورەو هەندێکیش دەڵێن لەگوڵانە. یەکێك لەو پیاوانەی ڕژێم کە لەخزمەت مامۆستادا دانیشتبوو ووتی ئەگەر دەستگیری بکەین خۆمان دەزانیین بە چ شێوەیەك سزای دەدەین، منیش ووتم بۆچی برا ئەو حەزرەتە پیاوی کوشتوە؟ بێجگەلە خزمەت بەموسوڵمانان و گەل و نیشتمانەکەی هیچ کارێکی ناڕەوای ئەنجامداوە تا ڕژێم لەسەری سزای بدات.

لەوکاتەدا تەماشای ڕوخساری مامۆستام کرد بەتەواوی خەمو پەژارە دایگرتبوو دەمم بردە لای گوێچکەی موبارەکیەوەو عەرزم کرد قوربان خەمو پەژارە لابە لەدڵتا ئێستا حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەگوندی کەیمنەیەو لەمەترسی دەستگیر کردن ڕزگاری بوو، بەبیستنی ئەم هەواڵە ڕوخساری پیرۆزی گەشایەوەو دڵشادبوو وەشوکرو سوپاسی خودای زۆر کردو بۆ سێجار لێی پرسیم هەربەڕاستی گەیشتوەتە کەیمنە منیش عەرزم کرد بەڵێ من خۆم لەخزمەتیدا بووم کە دوێنێ تەشریفی گەیشتە کەیمنە دووبارە فەرمووی خودایە شوکرت دەکەم بۆئەو هەواڵە خۆشە باوەموراد برا یاخودا هەرخۆش مژدەبیت.

هەروەها حاجی باوەموراد ووتی پاش ماوەیەك حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) کەسێکی نارد بۆلام بۆ ئەوەی هەواڵی گەیشتن و جێگیربونیان لەگوندی خانەگا بەمن ڕابگەیەنێت وەفەرمووبوی دوای ئەنجامدانی ئەوکارانەی کە فەرمانی پێ کردبوم بڕۆم بۆ خانەگا بەمەبەستی زیارەتی ئەو حەزرەتە. پاش چەند ڕۆژێك ڕۆیشتم بۆ سەردانی حاجی

محمدی دۆڵاشی و فەرمایشتەکانی ئەو حەزرەتەم پێ ڕاگەیاند حاجی محمد پێش ئەوەی وەڵامی سەلامەکەم بداتەوە یەکسەر هەواڵی ئەو حەزرەتەی لێ پرسیم منیش هەموو ڕوداوەکانم وەکو خۆی بۆ گێڕایەوەو پێم ووت سوپاس بۆ خودا ئێستا لەگوندی خانەگا بەئارامی نیشتەجێ بووەو لەهەموو کێشەو گرفتەکان پارێزراوە هەربۆیە زۆر خۆشحاڵ بوو وەشوکرو سوپاسی خودای بەجێ گەیاندو ووتی هەرچیم هەیە لەماڵ و دارایی دونیا دەیکەم بەقوربانی ئەو حەزرەتە سوێند بەخودا لەکاتی سوتانی ماڵ وگوندەکەمدا یەکسەر بڕیارمدا گایەك بکەم بەخەیری مەولودی پێغەمبەر (صلی الله علیه‌وسلم) تاوەکو ئەو حەزرەتە بەسەلامەت لەو مەینەتیە ڕزگاری بێت.

حاجی باوەموراد ووتی لەپاش هێوربونەوەی وەزعی ناوچەی شارەزووررو هەڵەبجە تائەندازەیەك خەڵك ترسی نەما هەربۆیە موریدەکان و ئەهلی خانەقا گەڕانەوە وەمنیش بەرەو خانەگاو پاوە بەڕێ کەوتم تاوەکو چۆنیەتی بەڕێوەچونی کارەکانی خانەقاو ئەنجامدانی فەرمانەکانی لە خزمەتیدا عەرز بکەم، وەئەگەر هەر فەرمانێکی دیکەشی هەبێت جێبەجێی بکەم. کەگەیشتمە سنوری ئێران پاسەوانەکانی سنوری ئەو وولاتە بەتۆمەتی سیخوڕی ڕژێم دەستگیریان کردم و پاشان بەرەو زیندانی کرماشان بردمیان کاتێك سواری ئۆتۆمبیل دەبووین بۆ ئەوەی بەرەو کرماشان بەڕێکەوین چاوم کەوت بەیەکێك لە موریدەکانی حەزرەتی شێخ ئەحمەدو (قدس سره) بەکورتی پێم ووت بەپەلە بڕۆ بۆ خزمەتی ئەو حەزرەتەو ئەمەی کە بینیوتە عەرزی بکەو پێی ڕابگەیەنە کە ئێستا بەرەو زیندانی کرماشان دەمبەن بۆ ڕۆژی دوایی پاسەوانی گرتوخانەکە دەرگای کردەوەو ووتی باوەموراد هەستە بڕۆ تۆ ئازادی کاتێك هاتمە دەرەوە چاوم بە کۆمەڵێك پیاو ماقوڵی شاری پاوەکەوت کە لەموریدەکانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) بوون. پاش

سڵاوو ئەحواڵ پرسین ووتیان حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) ئێمەی ناردوە تائازادت بکەین وەئێستا زۆر خەمبارە بۆ ئەم حاڵەی کە بەسەر تۆدا هاتووە هەربۆیە دەبێت بەپەلە بڕۆینە خزمەتی تاوەکو بەبینینت شادمان بێتەوە.

پاش ئەوەی گەیشتمەوە خزمەتی و دەستیم زیارەت کرد هەواڵی وەزعی هەڵەبجەو ئەو ڕوداوانەی کە لەپاش کۆچی جەنابیان بۆ خانەگا ڕوویاندابوو لەگەڵ چۆنیەتی ئەنجامدانی فەرمانەکانیم پێ ڕاگەیاند بەبیستنی ئەو هەواڵانە زۆر خۆشحاڵ بوو پاشان فەرمووی برا تۆ زۆر ماندووی بەهۆی سەفەرو زیندانەوە پێویستە پشوبدەیت، بۆماوەی هەفتەیەك لەگوندی خانەگا مامەوە کە بەهۆی هاتنی میوان و موریدو مەنسوبەکان بەمەبەستی زیارەتی ئەو حەزرەتە قەرەباڵغیەکی زۆر دروست بوبو بەشێوەیەك ئەگەر دەرزیت هەڵبدایە بەرەو ئاسمان نەدەکەوتە سەر زەوی کە زۆربەیان لەناوچەکانی ژاوەرۆو لەیلاخوسنەو سەقزو بۆکانەوە هاتبوون وەبەردەوام زیکرو خەتمەو مەراسیمەکانی دیکەی ئاین و ڕێبازی پیرۆزی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لەوماوەیەدا بەڕێوەدەچوو.

پاش ماوەیەك چوومە خزمەتی ئەو حەزرەتەو عەرزم کرد قوربان ئێرە زۆر قەرەباڵغە بەهۆی ئەو میوان و موریدانەی کە لەناوچەکانی دیکەوە هاتوون بۆ زیارەتت ئەگەر ڕوخسەتم بدەیت بامن بگەڕێمەوە بۆ هەڵەبجە بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی خانەقا وەئەگەر هەر فەرمانێکی دیکەش هەبێت جێبەجێی بکەم، فەرمووی برا خانەقا ئامادەبکەو ئیشوکارەکان بەچاکی ئەنجام بدە إنشاالله مانگی داهاتوو دەگەڕێینەوە بۆ هەڵەبجە عەرزم کرد قوربان چۆن دەگەڕێیتەوە لەکاتێکدا شیوعیەکان لەسەر حوکمن و زاڵن بەسەر هەموو ناوچەکەدا؟

فەرمووی لەم شەوانەدا خەوم بەفریشتەی مەرگەوە دی وێنەیەکی عبدالکریم قاسمی بەدەستەوە بوو دڕاندی و سەری لەلاشەی جیاکردەوە پاشان دەستی بەرزکردەوەو چوار پەنجەی پێ نیشاندام لەوانەیە پێش تەواوبوونی ئەم مانگە خودا ئەو ڕژێمە سەرنگوم بکات و ئێمەش ڕزگارمان بێت لە زوڵم و ستەمی بێباوەڕان.

بەبیستنی ئەو فەرمایشتە زۆر خۆشحاڵ بووم و ئومێدم پەیداکرد بە گەڕانەوەی ئارامی و دینداری بۆ وولآتەکەمان، هەرئەو ڕۆژە گەڕامەوەو فەرمانەکەیم جێبەجێ کرد وەچاوەڕێی ئەو موژدەیەم دەکرد لەڕاستیدا خەوەکەی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بەوشێوەی کە فەرمووی هاتەدی و لە ڕاگەیاندنەکانەوە هەواڵی کوژرانی عبدالکریم قاسم و ڕوخانی ڕژێمی بێباوەڕان بڵاوکرایەوە، هەفتەیەك لەدوای ئەو ڕاگەیاندنە ئەو حەزرەتەو ماڵ و منداڵی گەڕانەوە بۆ هەڵەبجە وەهەموو دۆستان و موریدانی باشوری کوردستان بەگەڕانەوەی شادمان و دڵخۆش بوون هەروەها خانەقاش قەرەباڵغی و گەرموگوڕی خەتمەو زیکری دووبارە بۆ گەڕایەوە.

## ( چەند نموونەیەك لەخەواریقەكانی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) )

**١ـ مەلا ئیبراهیمی نەسەناری كە موریدی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم بوو (قدس سره) بۆی گێڕامەوەو فەرمووی ئەوكاتەی كە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) تەشریفی هێنا بۆ ئیرشادی ژاوەرۆ موریدو مەنسوبێكی زۆری ناوچەی هەورامان لەخزمەتیدا بوون و ماوەی مانگێك ئەو سەردانە بەردەوام بوو كە زۆربەی گوندەكانی ئەو ناوچەیەی گرتەوە هەروەها موریدو مەنسوبەكان دڵگەرم و خۆشحاڵ بوون بەوهۆیەوە. كاتێك گەیشتینە بێساران* خەڵكی ئەو گوندە بەگەورەو بچوك و پیرو گەنجیەوە هاتن بۆ پێشوازی ئەو حەزرەتە لەكاتی زیارەت كردندا ژنێك كەلە ڕوخساریدا خەموگریان نمایان بوو هاتە خزمەتی و عەرزی كرد قوربان تەماشاكە عەزە هەشەمێزی[٢٦] چی بەسەرهێناوم لەوكاتەدا سەرپۆشەكەی سەری لابرد كە سەرنجماندا ئەو دڕندەیە قژی بەسەریەوە نەهێشتبوو هەمووی تاشیبوو بەبینینی ئەو كارەساتە یەكسەر فرمێسك بەچاوماندا هاتە خوارەوەو زۆر خەمباربووین پاشان ئەو ژنە عەرزی كرد قوربان تۆڵەم بۆبكەوە لە عەزە ئەو حەزرەتەش لەوەڵامدا فەرمووی سوێند بەخودای مەزن تۆڵەت بۆ دەكەمەوە خوشكم ئیدی غەم مەخۆو دوودڵ مەبە لەوپەیمانەی كە بەتۆم داوە.**

---

* شارەدێی بێساران كەوتوەتە ناوجەرگەی ژاوەرۆوە .......................... نووسەر

(٢٦) هەشەمێز گوندێكە لەناوچەی ژاوەرۆ وە(عەزە) هەشەمێزی یەكێك بووە لەسەرسەخت ترین چەتەی ئەو ناوچەیە كە حكومەتی ئەوكاتەی ئێران لەپێناو دەستگیر كردنیدا سەربازێكی زۆری بەكوشت دابوو هەربۆیە لەكۆتاییدا نائومێد دەبێت و بۆ دەستگیر كردنی پارەیەكی زۆر دیاری دەكات وەك پاداشت بۆ ئەو كەسەی دەستگیری بكات یا بیكوژێت .......... نووسەر.

لەوكاتەدا پۆلیسێك كە موریدی ئەو حەزرەتە بوو وەلەخزمەتیدا بۆ ئەو ئیرشادە هاتبوو عەرزی كرد قوربان من دەزانم ئێستا عەزە لەكوێ خۆی حەشارداوە هیمەتت بخەكارو دۆعاكانت بكە بە قەڵغان بۆم هەرئێستا دەچم و دەستگیری دەكەم فەرمووی بڕۆ دەستگیری بكە پشت بەخوداو ڕۆحی پیاوچاكان هەموو هیمەتێكی مەعنەویم دەخەمەكار بۆئەوەی سەركەوتوبیت لەوكارەداو ڕێگە بەترس مەدە زاڵ بێت بەسەرتدا، پاش ئەوەی پۆلیسەكە دەچێتە ئەو ئەشكەوتەی كە عەزە خۆی تێدا حەشاردابوو بەدەنگی بەرز بانگی دەكات و پێی دەڵێت عەزە خۆت بدە بەدەستەوە فەرمانی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامیم پێیە بۆ دەستگیر كردنت هەربۆیە ناتوانیت تەقەم لێ بكەیت عەزەش لەوەڵامدا دەڵێت من لەو هەڕەشانە ناترسم وەرە پێشەوە جائەوكات دەزانیت چۆن دەتكوژم كە پۆلیسەكە دەچێتە پێشەوە عەزە هەرچی هەوڵدەدات میلی سیلاحەكەی بێنێتەوە گیر دەكات و میلی بۆنایەتەوە لەوكاتەدا فیشەكەكانی دەگۆڕێت بەڵام هیچ سوودی نابێت و پۆلیسەكە دەستگیری دەكات پاشان حكومەت دادگایی كردو لەسێدارەدرا.

٢ـ حاجی ئەنوەری گۆبان بۆی گێڕامەوە ئەوكاتەی پێشمەرگەی یەكێتی بوون و ڕۆیشتبوون بۆ ناوچەی هەكاری، ووتی لەگەڵ حەمەی شاسوارو چەند پێشمەرگەیەكی دیكەدا كەوتینە ناو كەمینەوە بەئەندازەیەك شەڕەكە سەخت بوو كە ئومێدی ڕزگاربوونمان لەو كەمینە مەحاڵ بوو پاش ماوەیەك تەقە نەما بەڵام ئێمە نەماندەتوانی سەر بەرز بكەینەوە چونكە یەكسەر تەقەمان لێ دەكرا لەوكاتەدا خەو بردمیەوەو وەنەوزێكم كرد لەخەومدا بینیم حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) تەشریفی هێناو فەرمووی ئێوە پارێزراون و بەسەلامەت لەم شەڕە ڕزگارتان دەبێت.

پاش ئەوەی بەخەبەر هاتمەوە بە حەمەی شاسوارم ووت مژدەم بدەرێ ئێمە ڕزگارمان بوو ناکوژرێین، لێی پرسیم چۆن ڕزگارمان بوو لەکاتێکدا هەموو لایەکمان ئاگربارانە؟ خەوەکەم بۆ گێڕایەوە بە بیستنی ئەو خەوە کەمێك ئارام بوویەوە بەڵام هەر ترس مابوو لەدڵیدا پاشان بەسەلامەت لەو ناوچەیە دەربازبوین و هاتینەوە بۆ باشوری کوردستان. دوای ماوەیەك مانەوە لەناوچەی گەرمیان حەمەی شاسوار دێتە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەدو (قدس سره) لە خزمەتیدا تەمەسوکی تەریقەت وەردەگرێت، هەروەها داوای دۆعایەکی گولەبەندی لێ دەکات ئەو حەزرەتەش دۆعاکەی بۆ دەنوسێت و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ شاخ.

زۆرێك لە ڕیش سپیەکانی گەرمیان بۆیان گێڕامەتەوە کاتێك حەمەی شاسوار (بەڕەحمەت بێت) لەگوندی ژاڵە لەلایەن ڕژێمەوە ئابلۆقە دەدرێت هەرچی بە هەلیکۆپتەرو ئاربیجی و سیلاحەکانی دیکە تەقەی لێدەکەن ناتوانن شەهیدی بکەن وەتاکۆتا فیشەك بەرگری لەخۆی دەکات و سەربازێکی زۆر لەدوژمن دەکوژێت پاشان دەستگیری دەکەن و ئازارو ئەشکەنجەی زۆری دەدەن بەڵام هەرچی دەکەن ناتوانن بیکوژن تائەوکاتەی پۆشاك و کەلوپەلەکەی بەری دادەکەنن کە دۆعای گولە بەندەکەی لەناودابوو ئەوکاتە بە قەمە سەری دەبڕن و شەهیدی دەکەن.

٣ـ جەنابی شێخ عبدالباقی هاشمی[٢٧] (خودا بیپارێزێت) بۆی گێڕامەوەو فەرمووی سەید باهری برام کە خەلیفەی حەزرەتی شێخ ئەحمەد بوو (قدس سره) لەگەڵ کۆمەڵێك لە موریدەکانی تورکیا دەچنە هەڵەبجە بەمەبەستی زیارەتی ئەو حەزرەتە، مەرحومی سەید

---

[٢٧] کوڕی سەید قەدری خەلیفەی حەزرەتی حسامەدین (قدس سرهما) لە وڵاتی تورکیا ........................ نووسەر.

باهیری برام فەرمووی کاتی نوێژی عیشا بوو ئەو حەزرەتــە تەشــریفی هێنــا بــۆ خانــەقا تاوەکو بەجەماعەت نوێژ بکات، پێشنوێژ چووە ناو میحراب و دۆعای وەسیلەی خوێنــد لەوکاتەدا وویستم لەپاڵ ئەو حەزرەتەدا بوەستم و نوێژ بکــەم بــەڵام ئــەم خەیاڵــە هــات بەدڵمدا کە ئەو زاتە جێگەداری حەزرەتی حسامەدینە (قدس سره) بۆ من بێ ئەدەبیــە کــە لەپاڵ دەستیدا بوەستم بۆیە لەپشت سەری پیرۆزیەوە وەستام ئەم قسەیەی ناو دڵم کۆتایی نەهاتبوو ئەو حەزرەتە ڕووی موبارەکی وەرچەرخاندو فەرمووی برا سەید باهر وەرە لــەپاڵ دەستمدا نوێژ بخوێنە ئێمە هەموو مرۆڤین هیچ جیاوازیەکمان نیە لەحزوری پــەروەردگاردا بێجگەلە تەقواو عیبادەت نەبێت.

٤ـ جەنابی شێخ عەدنان (خودا بیپارێزێت) ئــەم ڕیوایەتــەی لــە خــاتوو نافیعــەی[٢٨] دایکیەوە بۆ گێڕامەوە کەوا شێخ عەتای کوڕی (بەڕەحمەت بێت) لەتەمەنی منداڵیدا کە ئــەو سەردەمە حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لەژیانــدا مــابوو، بەرامبــەر بەحــەزرەتی شــێخ ئەحمەد (قدس سره) بێ ئەدەبی دەکات و بەوهۆیەوە ئەو حەزرەتە دڵی لێ دەڕەنجێت و دۆعــای شەڕی لێدەکات پاش ماوەیەکی کەم مەرحومی شێخ عەتا لەســەرخۆی دەچــێت و لێــوی لاردەبێت لەوکاتەدا کە ئەو هەواڵەیان پێ گەیانــدم بەپەلــە بردمــە خزمــەت حــەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لەحاڵێکدا کە دەگریام بۆ کوڕەکەم و زۆر دەترسام نەوەك لەدەســتی بدەم عەرزم کرد قوربان عەتا حاڵی زۆر خراپــە لەوانەیــە لەناوبچــێت بــۆ خــاتری خــودا دۆعایەکی بەسەردا بخوێنە بەڵکو چاك بێتەوە ئەو حەزرەتەش فەرمووی عەتا دڵی قوتبی زەمانی ڕەنجاندوە کە ئەحمەدی برا گەورەیەتی تائــەو لێــی خۆشــنەبێت و دۆعــای شــیفای

---

[٢٨] خێزانی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم و کچی مــەرحومی شــێخ ئەبوبــەکر ئەفەنــدی خەلیفــەی حەزرەتی سراجەدین بووە (قدس سرهم) ........................ نووسەر.

بەسەردا نەخوێنێت من هیچم لەدەست نایەت بۆی بکەم پاشان بردمە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) دۆعای بەسەردا خوێند هەرلەوکاتەدا هاتەوە سەرخۆی و لێوی چاکتر بوویەوە. هەرچەندە شێخ عەتا (بەڕەحمەت بێت) لەونەخۆشیە ڕزگاری بوو بەڵام لەکاتی قسەکردندا تائەندازەیەك ئەو لاریە بەلێویەوە دیاربوو بەندە لەتەمەنی منداڵیدا گەیشتمە خزمەتی ئەو حاڵەتەم لەجەنابیاندا بەدی کرد.

## وێنەی ژمارە: (١٤)



(جەنابی شێخ عەدنانی حسامی نەقشبەندی لەتەمەنی لاویەتیدا)

## ( بۆردومانی شاری هەڵەبجەو کۆچی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بۆ شاری پاوە )

لـە پـاش ڕوخـانی ڕژێمـی عـبـدالکریم قاسـم و لاوازبـوونی حزبـی شـیوعی عێراقـی بۆماوەیەك زاناو مورشـیدە ئاینیـەکان ئازادیـەکی باشـیان بـۆ ڕەخسـا تـاوەکو خزمـەت و ئیرشادەکانیان بەسەرکەوتویی بەرامبـەر بـە گـەل و ئاینەکـەیان ئـەنجام بـدەن وەلـە سـتەم و بەربەستەکانی ئـەو حزبـە ڕزگاریـان بـوو هەرچـەندە پـێش ئـەوەی شـیوعیەکان بچـنە سـەر دەسەڵات بە ناڕاستەوخۆو ژێربەژێر زیانیان بەرێبازە ئاینیەکان دەگەیاند بەڵام بەهاتنە سەر دەسەڵاتیان ئەو زیانانە بەئاشکرا و بە گشتی کاریگـەرییان لـەناو کۆمـەڵگادا دروسـتکرد وەتوانیـان بـاوەڕو ڕەوشـتی زۆرێـك لەمرۆڤـەکان بگـۆڕن بـەرەو دژایـەتی کردنـی ئـاین و بنەماکانی کە تاوەکو ئێستاش ئەو کاریگەریە لەناو کۆمەڵگادا ڕەنگ دەداتەوە.

هەروەها بەهۆی ئەو ئاسایش و ئارامیە کاتیەی کە لەپاش ڕوخانی ئەو ڕژێمە هاتـەدی ئەوەبوو زاناو مەشایخە پایە بەرزەکان توانیان سوود وەربگرن بۆ بانگەشـەی ئـاین و ڕێبـازە مەعنەویەکانی ئەوەش بەهۆی ئەو دانوستانانەوە بوو کە مەلا مسـتەفای بـارزانی (بەرەحمەت بێت) لەگەڵ ڕژێمەکانی عبدالسلام عـارف و ئەحمـەد حەسـەن بـەکردا ئـەنجامی دەدا، بـەڵام لەکۆتایدا ئەو دانوستانانە بە بنبەست گەیشتن و لەساڵی (١٩٧٤)ی زاینیدا شاری هەڵەبجە لەلایەن فڕۆکە جەنگیەکانی ڕژێمەوە بەخەستی بۆردومـان کراو لەئەنجامدا چەند هاوڵاتیـەك شەهید بوون و هەندێك خانووبەرە وێران بوون هـەروەها خـەڵکی شـارەکە لەترسـی گیـانی خۆیان بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردستان کۆچیان کرد.

لەوکاتەدا حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) تەشریف دەبات بۆ شاری پاوە وەلەبەرئەوەی بەڕێوەبەری ڕێکخراوی (شـێرو خورشـید)ی ئـەو سـەردەمەو (مـانگی سـور)ی ئێسـتا لـەو شارەدا مەرحومی قازی ئەنساری بوو کە موریـدێکی زۆر خۆشەویسـتی ئـەو حەزرەتـە بـوو

هەربۆیە باڵەخانەی ئەو ڕێکخراوەی شاری پاوەی بۆ ئامادە دەکات تاوەکو خۆی و ماڵ و منداڵی و ئەهلی خانەقای تێدا نیشتەجێ ببێت.

کاتێك هەواڵی کۆچی ئەو حەزرەتە بۆ پاوە دەگاتە موریدەکانی ناوچەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان یەکسەر بەبێ ماتڵ بوون بەشەوق و مەحەبەتێکی زۆرەوە دەستە دەستە دێنە خزمەتی هەربۆیە ئەو شارە قەرەباڵغی و جەنجاڵێکی یەجگار زۆری موریدەکان دایدەپۆشێت وەئەو قەرەباڵغیە زۆرە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕژێمی ئەوکاتەی ئێران هەست بەسەنگ و قورسایی ئەو حەزرەتە بکات لەناوچەکەداو تەماحی بەدەست هێنان و سەر شۆڕکردنی ئەو حەزرەتە بۆ دەسەڵاتەکەی ببێت بە خولیاو ئاواتی هەر بەوهۆیەوە هەندێك ڕیش سپی و زانای ئاینی لەگەڵ هەندێك کەسوکاری ئەو حەزرەتە لەشاری سنە (کە ئەوکات ئەو شارە ناوەندی تەریقەت و زانست بوو لەڕۆژهەڵاتی کوردستاندا) کۆدەکاتەوەو بەسەرۆکایەتی نوێنەری بەڕێوەبەری دەزگای (ساواك)ی هەواڵگری ڕژێمی پەهلەوی دەیانێرن بۆ خزمەتی ئەو حەزرەتە.

لەوبارەیەوە سەید محمد نەسیمی ئیبراهیمی (بەڕەحمەت بێت) بۆی گێڕامەوەو ووتی ئەوکاتەی کە نوێنەری ساواك و ئەو کۆمەڵە زاناو کەسایەتیانەی شاری سنەی سەر بەڕژێم هاتنە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) من لە (شێرو خورشید) ئامادەبووم هەرچەندە تائەو کاتە تەمەسوکی تەریقەت و خەلافەتم لە خزمەتیدا وەرنەگرتبوو وەتەنها بەمەبەستی زیارەت و زیاتر ئاشنابوونم بەڕاستی و دروستی ڕێبازەکەی و جێگەداریی ئەو حەزرەتە چووبوم بۆ خزمەتی.

پاش بەخێر هێنان و ئەحواڵ پرسینی نێردراوەکان لەلایەن ئەو حەزرەتەوە، لەبارەی مامەڵەکردن بەو ڕێبازە پیرۆزەو خۆ ڕاسپاردنی بەو ڕژێمە هیچ گفتوگۆیەك نەکرا

تائەوکاتەی کە شیوی ئێوارە خورا بۆ دوای نوێژی عیشا یەکێك لەخزمەکانی ئەو حەزرەتە عەرزی کرد جەنابی نوێنەری ساواك و ئێمە دەمانەوێت لەخزمەت جەنابتان کۆبونەوەیەکی داخراو ئەنجام بدەین، پاشان چوونە ژورێکی دیکەوەو بۆ ماوەیەکی دورو درێژ لەو ژوورەدا گفتوگۆیان کرد کاتێك نوێنەری ساواك و شاندی یاوەری لە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) هاتنەوە بۆلای ئێمە زۆر دڵگران و خەمبار بوون یەکێك لەو خزمە ڕیش سپیانە خۆی پێ ڕانەگیراو دەستی کرد بەدەربڕینی ناڕەزایی بەرامبەر بە وەڵامدانەوەی ئەو حەزرەتە لەبۆ پێشنیارەکانیان و ووتی (نازانم جەنابیان بۆ ڕازی نابن بەهاوکاری و ملکەچ بوون بۆ ڕژێمی پەهلەوی باوکم ئێستا دنیا گۆڕاوە سەردەمی ڕابردوو نیە کەوا هەموو تواناکانت لەخزمەت ئاین و بیروباوەڕدا بەکاربێنیت لەم سەردەمەدا دەبێت هەموو شتێك بکەیت بە ئامراز بۆ خزمەت کردنی دەسەڵات تاوەکو بتوانیت خۆشگوزەرانی بۆ خۆت دابین بکەیت). هەندێك لەئامادەبوان لە شاندەکەیان پرسی وەڵامی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەوبارەیەوە چی بوو؟

لەوەڵامدا ووتیان ئەو حەزرەتە فەرمووی (من پەروەردەکراوی دەستی حەزرەتی حسامەدینم (قدس سره) وەڕەوشت و بیروباوەڕی ئەو حەزرەتەش ئەوەبوو کە لەگەڵ خوداو خەڵکدا بە پەنهان و بەئاشکرا ڕاستگۆ بووە نەك وەکو ئەو کەسانەی کە لە ڕووبەڕوی خەڵکدا بەجۆرێك خۆیان نیشان دەدەن و لەپەنهانیشدا پێچەوانەی ئەوەی کە خەڵك باوەڕیان پێکردون و بەجۆرێکی دیکە ڕەفتار دەکەن جالەبەرئەوە ئەگەر ئەم کارەی منتان پێ قەبوڵ ناکرێت ئەوا دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم و بالەژێر فڕۆکەو تۆپدا بەسەربەرزی بمرم پێم باشترە لەوەی کە ڕێبازەکەم ڕادەستی دەسەڵاتی ئێوەو بەرژەوەندیە دونیایەکان بکەم).
پاشان نوێنەری ساواك ڕووی کردە شاندەکەو ووتی ئەو ئامانجەی کە بۆی هاتین بەدەستمان

نەهێنا ئێستا دەبێت لێرە بڕۆین، ئەوەبوو هەربەو شەوە بەرەو سنە گەڕانەوە.

سەید محمد نەسیم ووتی لەپاش بیستنی ئەو گفتوگۆیانەو هەڵوێستی ئەو حەزرەتە لە بەرامبەر دەسەڵاتداران و حاکمەکانی ڕژێمدا بۆم ئاشکرابوو کە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بەڕاستی پیاوی خودایەو هەرئەو شایانی جێگەداری حەزرەتی حسامەدینە (قدس سره) وەلەڕاستیدا هەرئەو بوو کە پارێزگاری لە ڕێبازە پیرۆزەکەی دەکردو زۆر گرنگی بە دیکۆرو کاری ڕوکاری تەریقەت نەدەدا، هەرلەبەر ئەو هۆکارانە بۆ ڕۆژی دوایی لەخزمەتیدا تەمەسوکی تەریقەتم وەرگرت و پاشان ئەو حەزرەت لوتفی فەرموو ئیجازەی خەلافەتیشی پێ بەخشیم.

پاش ماوەیەك لەکۆبونەوەکەی ساواك لەلایەن ڕژێمی ستەمکاری پەهلەویەوە پیلانێکی ناڕەوا دژ بە ئەو حەزرەتە دادەڕێژرێت ئەویش بەجۆرێك کە گوایە هەواڵیان پێدراوە لەماڵەکەیدا چەك و تەقەمەنی ڕژێمی بەعس حەشاردراوە وەئەو حەزرەتەش پەیوەندی لەگەڵ ئەو ڕژێمەدا هەیە، هەربۆیە بەکرێ گیراوانی دەنێرێتە سەر ماڵەکەی و دەیپشکنن.

بەدیعە خانمی حەرەمی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بۆی گێڕامەوەو ووتی کاتێك ڕژێمی پەهلەوی هەڵیانکوتایە سەر ماڵمان ئەوەی کەلوپەل و جێگەوبان بوو تێکیاندا بەسەریەکدا وەئەو حەزرەتە زۆر قەڵس بوبو چونکە بێ ڕەچاوکردنی هیچ شعورێك گەڕابون بەناو جلوبەرگی حەرەمی و ژنەکانی ئەهلی خانەقادا. وەدیاربوو کە تەنها مەبەستیان لەوکارە هەتکی حورمەتی ئەو حەزرەتە بوو بەجۆرێك هەربەو کارەوە نەوەستان بەڵکو قاڵبی سابوونیشیان لەت دەکرد کە گوایە تەقەمەنی تێدایە هەربۆیە لەدوای نائومێد بوون لەو کارانەیان کە نەیانتوانی هیچ بەڵگەیەك لەدژی پەیدا بکەن بڕیاریاندا پاسەوان

لەبەردەرگایماڵمان دابنێین هەروەها بەهەموو شێوەیەك سەردان و زیارەتکردنی موریدو مەنسوب و دۆستەکان قەدەغەکرا.

سۆفی محمدی زامیاد بۆی گێڕامەوەو ووتی لەکاتی چاودێری کردنی ماڵی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەلایەن ڕژێمی پێشووی ئێرانەوە موریدەکان تەنها بۆیان هەبوو کە لەڕووبەڕوی ماڵی ئەو حەزرەتەدا بوەستن تاوەکو تەشریفی دەهاتە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەی وەئێمەش دەستمان بەرز دەکردەوەو سڵاومان لێ دەکرد ئیتر بۆمان نەبوو لەوە زیاتر هیچ گفتوگۆیەکی دیکە لە خزمەتیدا بکەین وەهەر بەوشێوەیە دەگەڕاینەوە، ئەو دەست بەسەریە بەردەوام بوو تائەو ڕۆژەی کە جەنابی شێخ مستەفای برای (بەڕەحمەت بێت) تەشریفی هێنا بۆ پاوەو چوو بۆ بەڕێوەبەرایەتی ساواك لەوێ پاش سەرزەنشت کردنی ئەو بەرپرسانە حوکمی ئازادکردنی ئەو حەزرەتەو ماڵ و منداڵی لەلایەن ڕژێمەوە پێ ڕاگەیاندبوون وەبە بەڕێوەبەری ئەو دەزگایەی ووتبوو (حەزرەتی شێخ ئەحمەد مورشیدی تەریقەتی حسامی نەقشبەندیەو بەئاوارەی و ناچاری ڕووی کردوەتە ئێران ئێوەش ئابەم شێوەیە میوانداری لێ دەکەن لەحاڵێکدا لافی میوانداری و ڕێز لە پەناهەندە لێدەدەن و دەڵێن میللەت و دەوڵەتی ئێران لەوبوارەدا بێ وێنەیە).

لەپاش ئەو چاو پێکەوتنە فەرمانی لابردنی دەست بەسەری ئەو حەزرەتە دەدرێت هەروەها بەرپرسانی فەرمی ڕژێم دێنە خزمەتی و عەرزی دەکەن هەر پێویستیەکتان هەبێت ئێمە ئامادەین بۆ جێبەجێ کردنی، حەزرەتی شێخ ئەحمەدیش (قدس سره) پێیان دەفەرموێت تەنها پێویستم بەگەڕانەوەیە بۆ نیشتمانەکەم وەلەوە زیاتر هیچ داواکاریەکی دیکەم نیەو چاوەڕوانی هیچ جۆرە چاکەیەکتان لێ ناکەم. لەکاتی گەڕانەوەی ئەو حەزرەتەدا بۆ باشووری کوردستان بەرپرسان و موریدەکانی شاری پاوە تکای زۆری لێ دەکەن کە

بەجێیان نەهێڵێت ئەو حەزرەتەش لەوەڵامیاندا دەفەرموێت براو خوشکانی تەریقەتیم خاترو دیداری ئێوە بۆ من زۆر عەزیزە وەهیچ کات دڵخۆش نیم بە دورکەوتنەوە لێتان بەڵام ئەو ڕژێمە ستەمکارەی ئێران و شۆربا خۆرەکانی بەشێوەیەك دژایەتیان کردم کە ئەگەر ئەوانە هەموو خاکی ئێران بکەن بەئاڵتوون و پێشکەشمی بکەن بۆئەوەی تیایدا بمێنمەوە ئەوا بۆ یەك ساتیش نامێنمەوەو بەجێی دەهێڵم.

بەدیعە خانمی حەرەمی ئەو حەزرەتە (خودا بیپارێزێت) بۆی گێڕامەوەو ووتی دواتر لەموریدەکانی پاوەم بیست کە لەگەڵ دروست بوونی شۆڕشی ئیسلامی ئێراندا ئەو بەرپرس و جاشانەی کە فەرمانی پشکنینی ماڵەکەمانیان دەرکردبوو بەوانەشەوە کە فەرمانەکەیان ئەنجامدابوو هەموویان لەلایەن شۆڕشگێرانەوە دەستگیر کران و پاشان کوژران.

## ( سەفەری حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بۆ جێبەجێ کردنی فەریزەی حەج و مانەوەی لە وڵاتی کوەیت بەهۆی نەخۆشیەوە )

ساڵی (١٩٧٧)ی زاینی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بڕیاری سەفەری حەج دەدات و لەو سەفەرەدا شێخ مەسعودی کوڕی مەرحومی شێخ مەحمودی برای لە خزمەتیدا دەبێت، لەکاتی ئەنجامدانی ئەو فەریزە پیرۆزەدا نەخۆش دەکەوێت کە خۆی پێشتر نەخۆشی شەکرەی لەگەڵدا بووە بەڵام بەهۆی ماندووبونی سەفەرو جێبەجێ کردنی مەناسیکەکانی حەج ئەو نەخۆشیە زۆر بەقورسی ئازاری پێ دەگەیەنێت.

شێخ مەسعود بۆی گێڕامەوەو ووتی لەکاتی ئەو نەخۆشیەیدا نانی پێ نەدەخورا هەرچی هەوڵمان دەدا تاوەکو خواردن بخوات بەڵام سوودی نەبوو وەخواردنی لەبەرچاو کەوتبوو، ئەم حاڵەی بەردەوام بوو تائەو کاتەی کە مەناسیکی فەریزەی حەجمان جێبەجێ کردو گەڕاینەوە بەرەو کوردستان بەهۆی ئەوەی لەو سەردەمەدا سەفەری حەج لەڕێی ووشکانی و بەئۆتۆمبیل دەکرا هەربۆیە لەکاتی گەڕانەوەماندا لەووڵاتی کوەیت بۆ چەند ڕۆژێك بەمەبەستی پشوودان و وەرگرتنی چارەسەری پزیشکی لەهوتێل ماینەوە لەوماوەیەدا شەخسێك هەواڵی زانیبوو کە ئەو حەزرەتە تەشریفی لە (کوەیت)دایە هاتە خزمەتی و پاش بەخێرهێنان و ئەحواڵ پرسین دەستی زیارەت کردو عەرزی کرد قوربان من کاتی خۆی بۆ ماوەیەك نەدارو ئاوارە بووم هاتمە خانەقاکەی جەنابت لە هەڵەبجە خزمەتێکی زۆرتان کردم وەبە ئەوپەڕی ڕێزەوە هەڵسوکەوتتان لەگەڵدا کردم.

ئێستا وەزعم زۆرباشەو دەوڵەمەندم وەئەوەی کە بەدەستم هێناوە لەبەرەکەتی ئەو ماوەیەی دەزانم لە خزمەتی جەنابتاندا بووم، بەوهۆیەوە هاتومەتە خزمەتت وەکو وەفایەك بەرامبەر بەو لوتف و خزمەتانە ئەم جانتایە پڕە لەدیناری کوەیتی و هەدیەی منە بۆ

جەنابت هیوادارم لیّم قەبولْ بکەیت.

حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەوەڵامیدا فەرمووی (من خانەقام دانەمەزراندوە تاوەکو خزمەتی خەڵك بکەم بەمەرجی پاداشتیان من پاداشتم لەخودا دەوێت و وەفاو مەحەبەتیش لەئێوە وەکاری من کاسبی کردن نیە بە ڕێبازی پێغەمبەرو (صلى الله عليه‌وسلم) ئەولیاکانەوە بەوهۆیەوە پارەی خۆت هەڵگرە بۆ خۆت و وابزانە کە گەیشتووە بەمن هەر ئەو وەفاو مەحەبەتەی کە تۆی هێناوە بۆ ئێرە تاوەکو زیارەتی من بکەیت بۆ من عەزیزترە لەهەموو خۆشیەکانی دونیا). شێخ مەسعود ووتی ئەو پیاوە زەنگینە هەرچی پاڕایەوەو تکای کرد لەو حەزرەتە تاوەکو ئەو پارەیەی لێ وەربگرێت بەڵام هیچ سوودی نەبوو.

ئەم بەسەرهاتە بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ سەلماندنی بەرزی هیمەت و خوڕەوشتی بۆ خودا سوڵحاوی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (خودا پایە بەرزتری بکات و پەیڕەوانیشی سەرکەوتو بکات بۆ جێبەجێ کردنی ڕێبازە پیرۆزەکەی، آمین).

❊ ❊ ❊

## (زیارەتی پارێزگاری سلێمانی و ئەندامانی حزبی بەعس بۆ خزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەدو پێشنیاری چەك هەڵگرتنی ئەو حەزرەتە)

پاش چەند ساڵێك لە هەڵگیرسانی جەنگی عێراق و ئێران كە ئەوكاتە بەندە تەمەنم لەنێوان حەوت بۆ هەشت ساڵ بوو ڕۆژێكیان هەواڵیان هێنا بۆ حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) كەوا پارێزگاری سلێمانی كە (شێخ جەعفەر بەرزنجی) بوو لەگەڵ شاندێكدا دێن بۆ خزمەتی بەمەبەستی زیارەت، ئەو حەزرەتەش فەرمووی بە موریدەكان ئەمانە میوانن وەبەهەموو شێوەیەك دەبێت ڕێز لەمیوان بگیردرێت هەربۆیە قاوەیان بۆ ئامادەبكەن، پاش ئەوەی شاندەكە گەیشتن و بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا كرا شێخ جەعفەر عەرزی كرد (قوربان حكومەتی بەعس هاوكاری و یارمەتیەكی فراوان دەبەخشێت بەو كەسانەی كە چەكی بۆ هەڵدەگرن و دژ بەئێران دەجەنگن هەروەها زۆرێك لە مەشایخی تەریقەت و ڕەئیس عەشرەتەكان هاتوون بەدەم ئەو داواكاریەوە تەنها جەنابت نەبێت وەبەهۆی ئەوەی كە پەیڕەوانێكی زۆرت هەیەو هەندێك لە كەسوكارەكانت فەرمانەكانت جێبەجێ دەكەن هەربۆیە ئێمە هاتووین بۆ خزمەتت كە پێتان ڕابگەیەنین حزبی بەعس هاوكاریەكی باشی بۆتان ئامادەكردوەو هەرچیەكتان پێویست بێت لەپارەو چەك و ئازوقە پێشكەشتان دەكات بۆ ئەو مەبەستە).

لەكاتی تەواوبوونی ووتەكانی پارێزگاردا قاوەكەیان هێنا ئەو حەزرەتە بە توڕەییەوە فەرمووی ئەمانە نەهاتوون میوانی من بن لەبەرئەوە قاوە ناخۆن بیبەنەوە، پاشان حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بەپارێزگاری فەرموو ئێران لە نەوسوودەو خاكی وولاتەكەمی داگیر نەكردوە من ئەگەر چەك هەڵگرم واتە دەبێت خاكی ئەو داگیركەم ئەم كارەش لەڕوانگەی ئاین و ڕێبازە پیرۆزەكانیەوە زوڵم و ستەمكاریە.

هەروەها ئەو حزبەی کە تۆ نوێنەرایەتی دەکەیت گوندەکەمی وێرانکردووەو خەڵکەکەی ئاوارە کردوە وەئێستا مەرقەدی باپیرەو مورشیدم حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) کەس نیە بیپارێزێت لە وێران بوون، وەتۆ هاتویت داوای چەك هەڵگرتنم لێ دەکەیت بۆ ئاوەها حزبێك بەڕاستی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لای من زۆر نامۆیە لەبەرئەوە وەڵامی من بۆ ئێوە نەخێرەو فەرموون خوا حافیزتان بێت.

لەپاش کۆڕەوەکەی ساڵی (١٩٩١)، ئەوکاتە خانەقای ئەو حەزرەتە لە شاری سنە پڕ بوبو لە خزمو کەس و خەڵکی ئاوارەی باشوری کوردستان وەئەو شوێنە پیرۆزە بوبو بەپەناگای زۆرێك لەو هاوڵاتیانە، یەکێك لەو خزمە ئاوارانە بەناوی شێخ فایەقی نەقشبەندی کە نەوەی حەزرەتی (ضیائەدین)ە (قدس سره) بۆی گێڕامەوەو ووتی پێش ڕاپەڕین بەچەند ڕۆژێك چاوم کەوت بە شێخ جەعفەری پارێزگاری سلێمانی و باسی ئەو سەردانەی بۆ کردم کە چووبون بۆ ڕازی کردنی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) کە چەك هەڵبگرێت بۆ ڕژێمی بەعس هەروەها گلەیی لێ دەکرد بەهۆی ئەو هەڵوێست و بەرێ کردنەی کە نواندی لە بەرامبەریاندا، منیش پێم ووت تۆ لەبری ئەوەی فەخر بکەیت کە لەناو گەلەکەتدا پیاوی ئەوەندە شەریف و مەرد بوونی هەیەو ئاواتە خواز بیت کە نموونەی زۆربێت ئابەوشێوە گلەیی و ڕەخنەی لێ دەگریت، ئێمە وەکو خزم و کەسی ئەو حەزرەتە زۆر شانازی دەکەین کە زاتێکی وەها پیرۆز توانیبووی جێگەو مەقامی پیرانی تەریقەت ڕابگرێت و هیچ کات نەیدەگۆڕیەوە بە ماڵ و دارایی و سوودی دونیایی.

پاش ماوەیەك لە سەردانی شاندەکەی حزبی بەعس ئەوەبوو لەلایەن دەزگای هەواڵگیری و ئەمنی ئەو ڕژێمەوە هەواڵیان نارد بۆ ئەو حەزرەتە کەوا دەبێت تەشریف ببات بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئەو دەزگایە لە سلێمانی، بۆ ڕۆژی دوایی ئەو حەزرەتەو هەندێك

لە خزمو کەسەکان لە خزمەتیدا ڕۆیشتن بۆ سلێمانی لەکۆبونەوەکەدا بەڕێوەبەری دەزگاکە عەرزی کردبوو ئەمە کۆتا ڕاگەیاندنمانە بۆ جەنابت لەبەرئەوەی زۆرێك لە هاووڵاتیان پەیڕەوو موریدی جەنابتن وەلەهەر شوێنێك کە چاویان بەتۆ دەکەوێت بە جۆشو خرۆشەوە دێن بۆ پێشوازی و زیارەت کردنت بۆ نموونە هەواڵمان پێ گەیشتووە کە هەرکات تەشریف دەبەیت بۆ (سەید سادق) بەمەبەستی سەردان یا سەرەخۆشی لەبەر قەرەباڵغی زیارەت کاران و موریدەکانت ئۆتۆمبیلەکەت دادەپۆشرێت جالەبەرئەوە ئەگەر دەتەوێت ئەو جۆرە پێشوازیە بەردەوام بێت داوات لێ دەکەین کە هاوکاریمان بکەیت و هاوشێوەی دۆستەکانمان چەکمان بۆ هەڵگرە دژ بە ئێران، وەئەگەر بێت و هاوکاریمان نەکەیت دەبێت گۆشەگیری ماڵی خۆت بیت وەهەوڵی زۆر دەرکەوتن نەدەیت لەناو خەڵکداو تەشریف نەبەیت بۆ سەردان و سەرەخۆشی ناوچەکانی دیکە چونکە ئێمە ڕازی نابین بە دەربڕینی ئەو هەمووە خۆشەویستی و پێشوازیە گەرمەی هاووڵاتیان بۆ کەسێك کە ملکەچی فەرمانەکانی حیزب نەبێت و لەشۆربا خۆرەکانی ئێمە ئەژمار نەکرێت. حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەوەڵامدا دەفەرموێت پێشنیاری دووهەم هەڵدەبژێرم و گۆشەگیری ماڵ و خانەقاکەم دەبم وەئەگەر زۆر پێویست نەبێت بۆ سەردان و سەرەخۆشی کەس ناچم.

بیروباوەڕی ئەو حەزرەتە ئەوەبوو کە بەلایەوە پەسەند بوو پەیوەندی ڕێزو حورمەت لەگەڵ دەسەڵاتدا ببەستێت بەڵام هەرکات دەسەڵات بیوویستایە و هەوڵی بدایە بۆ بەکرێ گرتن و بەخراپ سوود وەرگرتن لەو حەزرەتەو ڕێبازەکەی ئەوا لەوکاتەدا بەتوندی دەچووەوە بەگژ ئەو دەسەڵاتەو هەڵقە لەگوێکانیدا هەربۆیە تاوەکو لەژیاندا بوو سەری بۆ هیچ دەسەڵاتێك شۆڕ نەکردو ئەوانیش بەهیچ شێوەیەك نەیانتوانی بیکەن بە نۆکەری خۆیان.

## (ڕا پەڕینی هەڵەبجەو ڕاگرتنی تەقاندنەوەی خانووەکانی گەڕەکی کانی عاشقان لەلایەن ڕژێمەوە)

ساڵی (١٩٨٧) بەهۆی سەرکەوتنی پێشمەرگە لەهەندێك ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ سوپای عێراقدا هاوولاتیانی کوردستان زۆر دڵگەرم و بەحەماسەت بوون بۆ ڕاپەڕین دژ بە ڕژێم بەتایبەت لاوانی خوێن گەرمی ئەوکاتەی شاری هەڵەبجە بەهەمان شێوەی ڕابردوو کە هەڵەبجەییەکان هەمیشە لەڕیزی پێشەوەی بەرخودان و بەگژاچوونەوەی ستەمکارانی دژ بە کوردو کوردستان بوون لەو ساڵەشدا لەلایەن هاوولاتیانی ئەو شارەوە بەتایبەت لاوەکانی گەڕەکی کانی عاشقان دەستکرا بە ڕاپەڕین و خۆپیشاندان وەبۆ چەند ڕۆژێك درێژەی خایاند بەڵام بەهۆی بەکارهێنانی زەبرو زەنگ و هێزی سەربازی لەلایەن ڕژێمەوە ئەو ڕاپەڕینە سەرکوت کراو چەند لاوێك شەهید کران و هەندێکی دیکەش لەهاوولاتیان ئەنفال کران پاشان ڕژێم حەملەی تەقاندنەوەی گەڕەکی کانی عاشقانی دەست پێکرد لەبەرئەوەی ڕاپەڕینەکە لەو گەڕەکەوە سەری هەڵدابوو کە خانەقای حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەناوەندی ئەو گەڕەکەدایە، لەوکاتەدا ئەو حەزرەتە بانگهێشتی هەندێك زانای ئاینی و پیاو ماقوڵانی شارەکەی کردو پێی فەرموون بابڕۆین بۆلای قایمقام و فەرمانەدەی سوپاو داوایان لێ بکەین کە ئەم وێرانکاریە ڕاگرن تاوەکو هەژاران و بێ دەسەڵاتەکان وەیلان نەبن.

ئەو حەزرەتە دووجار تەشریفی برد بۆلای ئەو بەرپرسانە بەڵام بێ سوود بوو وەوەڵامیان ئەوەبوو کە ئەو کارە بەفەرمانی ڕاستەوخۆی سەدام حسەین ئەنجام دەدرێت و کەس ناتوانێت ڕایبگرێت، بۆ جاری دووهەم کە گەڕایەوە ماڵەوە زۆر قەڵس بوبو لەو ڕژێمەو فەرمووی دەبێت بەزوترین کات ئێرە چۆڵکەین و کەلوپەلەکان بڵاوە پێبکەن من

ئیتر لەوەزیاتر ناتوانم ستەمو زەبرو زەنگی ئەم ڕژێمە قەبوڵ بکەم هەربۆیە کوردستان بەجێ دەهێڵم، یەکسەر هەموو ئەهلی خانەقا دەستیان کرد بە گواستنەوەی کەلوپەلی ناومال و بڵاوەیان پێکرد لەنێوان ماڵی ناسراوو خزمەکانمان لەگەڕەکەکانی دیکەی هەڵەبجە، لەمیانەی گواستنەوەی ئەو کەلوپەلانەدا ڕۆژێکیان جەنابی عیزەت بەگی حەمە سالح بەگی جاف (بەڕەحمەت بێ) کە خەزوری ئەو حەزرەتە بوو وەلەڕاستیدا مرۆڤێکی بەدین و خاوەن ڕەوشتی بەرز بوو هەروەها مەحەبەتێکی فراوانیشی بۆ ئەو حەزرەتە هەبوو، بەبیستنی ئەو هەواڵە یەکسەر تەشریفی هێنا بۆ خانەقاو لەگەڵ چاوی کەوت بەو ڕاگواستن و شپرزیەی حەزرەتی شێخ ئەحمەدو (قدس سرە) ماڵو منداڵی بەخەمباریەکی زۆرەوە فرمێسك بەچاوی پیرۆزیدا هاتە خوارەوەو خۆی پێ ڕانەگیرا کە بەپێوە بوەستێت و لەسەر زەویەکەی دەرەوەی ماڵەکەدا دانیشت.

پاشان کە بۆی دەرکەوت ئەو حەزرەتە بڕیاری تەواوەتی داوە کوردستان بەجێ بهێڵێت و بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردستان کۆچ بکات خەمو پەژارەکەی زۆر زیاتر بوو وەداوای لێ کرد کە ئەو کارە نەکات و فەرمووی ماڵ و خانەقاکەت بگوێزەرەوە بۆ سلێمانی من بەرگەی دووری ئێوە ناگرم. ئەو حەزرەتەش باسی چۆنیەتی ڕووداوەکان و هۆکاری ئەو بڕیارەی عەرزکرد، پاشان جەنابی عیزەت بەگ (بەڕەحمەت بێت) تەشریفی بردەوە بۆ سلێمانی.

لەوماوەیەدا هەستمان بەوەدەکرد کە دەنگوباسی کۆچی ئەو حەزرەتە بۆ دەرەوەی وڵات بەهەموو لایەکدا بڵاوبوەتەوە لەبەرئەوەی پاش چەند ڕۆژێك لە دەستکردنمان بەگواستنەوەی کەلوپەلەکان هەندێك خەڵکی نەناسراو لە ژن وپیاو دەهاتن بۆ خانەقاو ماڵی ئەو حەزرەتە وەبۆ ماوەیەك بەبێ ئەوەی بزانرێت کە بۆ چ مەبەستێك هاتوون دەمانەوە. ڕۆژێکیان دەمەونیوەڕۆ بوو کە کۆتا بەشی کەلوپەلی خانەقا خەریك بوو دەخرانە

ناو بارهەڵگرەکانەوە لەناکاودا سەربانی خانووەکانی دەوروپشتی خانەقا پڕبوو لە جاشو جەیشی ڕژێم وەخەڵکی گەڕەك زۆر ترسان، پیاوێکی لاو کە پۆشاکی کوردی لەبەردابوو وەچاویلکەیەکی لەچاودابوو ویزیەکی بەدەستەوە بوو بەعەرەبی بە جاشەکانی ووت خەڵکی ئەم گەڕەکە بانگهێشت بکەن بۆ خانەقا پاشان ئەو پیاوە ڕۆیشت بۆ خانەقاو بە موریدەکانی ووتبوو عەرزی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامی (قدس سره) بکەن هاتووین فەرمانمان هێناوە بۆ جەنابیان باتەشریف بێنن بۆ خانەقا.

کاتێك تەشریفی هێنا ئەوەی کە مابوویەوە لەخەڵکی گەڕەك و کۆچی نەکردبوو ئامادەبوون لە خزمەتیدا پاش سڵاوو دەربڕینی ڕێز ئەو بەرپرسە عەرەبە ڕووی کردە ئەو حەزرەتەو خەڵکەکەو ووتی (ئاگادارتان دەکەینەوە کەوا فەرمانی تەقاندنەوەی خانووەکانی کانی عاشقان لەبەرخاتری حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامی نەقشبەندی لەمڕۆوە ڕاگیرا وەئیتر ئێوە دەتوانن بڕۆنەوە ماڵەکانی خۆتان و بەئارامی ژیان بەسەربەرن). ئامادەبوان بەبیستنی ئەو هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بوون و شوکری خودایان کرد بەڵام ئەو حەزرەتە دڵنیا نەبوو لەبەڵێنەکەی ئەو ڕژێمە چونکە لەڕابردوودا بەڵێنی زۆری دابوو بەگەلەکەی و پابەند نەبوو پێیانەوە بەڵام ئەو حەزرەتە لەبەر نائومێد نەبوونی خەڵکی گەڕەك مایەوەو کۆچی نەکرد.

لەڕاستیدا چۆنیەتی بڕیاری ڕاگرتنی تەقاندنەوەی کانی عاشقان بە دوورو درێژی بۆ ئێمە باس نەکرا تائەو کاتەی ئاوارەکانی ڕاپەڕینەکەی ساڵی (١٩٩١) گەیشتنە شاری سنە، هەندێك لەو کەسانەی کە لەگەڵ ڕژێمدا پەیوەندیان هەبوبو ئەو ڕاستیەیان بۆ گێڕاینەوەو ووتیان ئەوکاتەی کە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بڕیاری کۆچکردنی دابوو بەرەو دەرەوەی وولات ئەو هەواڵە دەگەیەنن بە سەدام حسەین و پێی ڕادەگەیەنن کە بەهۆی

گوێنەدان و نافەرمانی کردنی بەرپرسەکانی هەڵەبجە لەبەرامبەر ئەو حەزرەتەدا بۆ ڕاگرتنی پرۆسەی کاولکردنی کانی عاشقان هۆکاری ئەو بڕیارەی بووە، وەئەگەر بەوشێوەیە کۆچ بکات بەرەو دەرەوەی وولات ئەوا یەك سەربازی عێراقی ناتوانێت لە کوردستاندا بمێنێتەوە. هەر بەوهۆیەوە سەدام بەپەلە ئەو بڕیارەی دەرکرد.

## ( کارەساتی کیمیاباران کردنی هەڵەبجەو کۆچکردنی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان )

چەند مانگێك لەدوای تێپەڕبوونی ڕووداوەکەی کانی عاشقان و مەسەلەی تەقاندنەوەی ئەو گەڕەکە لەلایەن ڕژێمەوە، دەنگوباسی هێرشی ئێران بۆ ناوچەی هەڵەبجەو شارەزوور بڵاوبویەوە لەشارەکەداو خەڵکانێکی زۆریش دڵنیابوون لەو هێرشە. ڕۆژێکیان هەندێك لە خزمو کەسوکار هاتنە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەدو (قدس سره) عەرزیان کرد هیچ گومانمان نیە لەوەی کە لەم نزیکانەدا هەڵەبجە لەلایەن ئێرانەوە کۆنترۆڵ دەکرێت لەبەرئەوە لێت دەپاڕێینەوە کە تەشریف ببەیت بۆ سلێمانی تاوەکو خۆت و ماڵ و منداڵت پارێزراوبن لەوجەنگەدا چونکە تەبعو عادەتی ڕژێمی بەعس بەشێوەیەك بوو کەکاتێك ناوچەیەکی لەدەست بدایە یەکسەر کیمیابارانی دەکرد بەڵام ئەو حەزرەتە هەمیشە هەوڵی بۆئەوە دەدا کە لەخۆشی و ناخۆشی هاوولاتیانی شارەکەیدا بەشداربێت وەتائەو ئەندازەیەی کە بۆی گونجابێت بەجێیان نەهێڵێت.

لەبارەی چۆنیەتی هێرشەکەی ئێران و کیمیابارانی شاری هەڵەبجە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە کتێب و فیلم و لێدوانی زۆر نووسراوەو ئامادەکراوە بەوهۆیەوە لێرەدا تەنها باسی چۆنیەتی کۆچی ئەو حەزرەتەو ماڵ و منداڵی دەکەین بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

شانزەی سێی هەزارو نۆسەدو هەشتاو هەشت (١٦|٣|١٩٨٨)ی زاینی بوو لە دەمەو نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا فڕۆکە جەنگیەکانی ڕژێم دەستیان کرد بە بۆردومانی هەڵەبجە لەوکاتەدا لە خزمەت ئەو حەزرەتەدا لەخانەقا دانیشتبووین هەستمان بەلەرزەی پایەو دیوارەکان دەکرد پاشان تادەهات دەنگی بۆمبەکان زیاتر دەبوو بەپەلە هەموو خەڵکەکە بەرەو ژێر زەمین هەڵهاتن بۆردومانەکە تاوەکو دەمەو ئێوارە بەردەوام بوو پاشان دەنگی

فرۆکەو هاویشتنی بۆمب نەما وەلەماوەی نیو کاتژمێردا خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد پاش ماوەیەکی کەم هەواڵمان پێ گەیشت کەوا هەڵەبجە کیمیاباران کرا لەوکاتەدا خەڵکی گەرەك هاتنە خزمەت ئەو حەزرەتەو عەرزیان کرد قوربان چی بکەین ڕێگە چارەیەکمان بۆ دابنێ ئەویش فەرمووی (خوشکو براکانم تەنها چارەمان ئەوەیە کە ئێستا شارەکە بەجێ بهێڵین و وەکو چۆن تائێستا پێکەوە ژیاوین هەربەوشێوەیە پێکەوەو بەکۆمەڵ بەڕێ دەکەوین بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەروەها بەگوێرەی توانا ئازوقەو کەلوپەل لەگەڵ خۆتاندا هەڵگرن). ئەوەی کە ئۆتۆمبیلی هەبوو لەڕێگەی شارۆچکەی سیروانەوەو ئەوانی دیکەش لەڕێی بامۆکەوە بەرەو سنورەکان بەڕێ کەوتن لەکاتی بەجێ هێشتنی شارەکەدا هەندێك لە خەڵکەکە حاڵیان تێکچوو وەدەرشانەوە بەهۆی کاریگەری کیمیایەکەوە بەڵام بەندە دەسماڵێکی هەوریشمم پێبوو بەردەوام تەڕم دەکردو دەموچاوم پێ دادەپۆشی بەوهۆیەوە تائەندازەیەك حاڵم باشتر بوو، پاش مەغریب لەخزمەت ئەو حەزرەتەدا بەرێکەوتین بەرەو گوندی ئەحمەدئاوا کە گەیشتینە ناحیەی سیروان هەستمان بەبۆنی سێو دەکرد ئەوکاتە نەماندەزانی ئەو بۆنە چیە.

پاش ئەوەی لەو ناحیەیە دەرچووین و گەیشتینە نزیك پردی زەڵم تایەی ئۆتۆمبیلەکە پەنچەر بوو وەهیچ ئامێرێکی گۆڕینی تایەشمان پێ نەبوو ماوەیەك لەوشوێنەدا ماتڵ بووین لەناکاو ئۆتۆمبیلێکی سوپای پاسداران لەهەڵەبجەوە بەرەو پردەکە دەهات کە چاویان بەئێمە کەوت یەکسەر لایاندا چەند پاسدارێك دابەزین و هاتنە خزمەت ئەو حەزرەتە فەرماندەکەیان کە پیاوێکی لاوی باڵابەرز بوو باوەشی کرد بە حەزرەتی شێخ ئەحمەدداو (قدس سره) ووتی حاجی ئاغا هەرکە لەدوورەوە چاوم بەجەنابت کەوت زۆر سەرسام بووم پێتان بەهۆی ئەو سیما موبارەك و نورانیەتانەوە لەدڵی خۆمدا ووتم لەوانەیە ئەمە فریشتە

بێت لەشێوەی مرۆڤدا یا ئەولیایەکی موقەڕەبی خودایە، ئەو حەزرەتەش فەرمووی من شێخ ئەحمەدی حسامیم وەهاووڵاتیەکی شاری هەڵەبجەم، پاشان فەرمووی ئەی جەنابت ناوت چیە؟ عەرزی کرد ناوم (حاجی عبداللە)یەو فەرمانەدەی سوپای پاسدارانی مەریوانم وەئێستاش هەرچیەکتان پێویستە من لە خزمەتتانەدام ئەو حەزرەتەش فەرمووی ئۆتۆمبیلەکەمان پەنچەرەو ئامێری تایە گۆڕینمان پێ نیە. فەرماندەکە یەکسەر فەرمانیدا بە سەربازەکان کە ئامێر بێنن، تایەکەیان گۆڕی و پاشان عەرزی کرد ئێوە هەمووتان لەو ئۆتۆمبیلەدا جێگەتان نابێتەوە هەندێکتان بالەگەڵ ئێمەدا سواربن لەدوای ئەوە بەڕێکەوتین بەرەو گوندی ئەحمەدئاوا کاتێك گەیشتینە ناو گوندەکە حاجی عبداللە عەرزی ئەو حەزرەتەی کرد ڕوخسەتم بدە بەم ئۆتۆمبیلەی خۆم بتانگەیەنمە شاری مەریوان ئەم کارە بۆ ئێوە باشترەو زۆر ماندونابن تەنها بە دوو کاتژمێر دەتانگەیەنمە ئەو شارە بەڵام ئەو حەزرەتە قەبوڵی نەکردو فەرمووی ئەم خزمەتەی جەنابت کە تاوەکو ئێرە لەگەڵماندا بوویت بۆ ئێمە زۆرەو هەمیشە لەیادمانە بەهۆی ئەوەی ئەرکەکەتان قورسەو بەرپرسیارن لە سوپادا من پێم خۆش نیە ببمە بەربەست لەبەردەم کارەکانتان و هەربۆیە ئەوە قەبوڵ ناکەم کە بەهۆی ئێمەوە نەتوانیت بەرپرسیاریەکەت بەسەرکەوتوی ئەنجام بدەیت لەبەرئەوە زۆر سوپاست دەکەم و لێرەدا دەبێتماڵئاوایتان لێ بکەین و خوا حافیزتان بێت.

کاتێك گەیشتینە ئەحمەدئاوا شەو درەنگی کردبوو ئێمەش زۆر ماندوو بووین وەتەنها ڕێگەیەکیش کە خەڵك دەیتوانی پێیدا بڕوات بەرەو زەڵمو کەڕەجاڵ پیادەڕەوی بوو وەڕێگەی دیکەی نەبوو بۆ ئۆتۆمبیل، هەربۆیە ئەو شەوە لەوگوندەماینەوە شەوێکی زۆر سارد بوو لەبەرئەوە هەندێك داریان کۆکردەوەو لەنزیك ئێمەدا ئاگریاندا تاوەکو کەمێك گەرمان بێتەوە. پاشان من و عادلی برام چووینە ناو ئۆتۆمبیلەکەو لەبەرئەوەی زۆر ماندوو بووین

خەو بردینیەوە سەرلەبەیانی کە خەبەرمان بوویەوە سەرو چاومان زۆر دەئێشا وامان هەست دەکرد کە هەڵئاوساوە دەت ووت تووشی درمێکی سەخت بووینە هەربۆیە لەخزمەت ئەو حەزرەتەدا چووین بۆ قوتابخانەی گوندەکە کە پێشمەرگەی تێدابوو وەپزیشکێکیان لەگەڵدا بوو ئەو حەزرەتە فەرمووی ئەگەر دەرمان و ئەمپولی دژە کیمیاویتان لەلاهەیە بەکاری بهێنن بۆ ئەم منداڵانە بەڵکو ئازاریان کەمبێتەوە عەرزیان کرد ئەمپولی ئارام بەخشمان هەیە بەڵام تا دوو کاتژمێر کاریگەری هەیە کە گەیشتنە گوندی دزڵی لە نەخۆشخانەکەیدا چارەسەری پێویستیان بۆ بەکاردەهێنن.

دواتر بەڕێ کەوتین بەرەو شاخی کەڕەجاڵ پێشمەرگەیەکیان لەگەڵماندا نارد بۆ ڕێنوێنی چونکە ئەو ناوچەیە لەلایەن ڕژێمەوە مینرێژ کرابوو، بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە هاوینە هەواری زەڵم ئەو شوێنەی کە پێشتر مولّکی حەزرەتی حسامەدین بوو (قدس سره) لەنزیك پردەکەوە سەکۆیەك دروست کرابوو حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەسەری دانیشت بەندەو عادلیش لەبەر ئێشی سەرو دەموچاومان خۆمان پێ ڕانەگیراو سەرمان خستە سەر هەردوو ڕانی موبارەکی ئەوکاتە تەمەنم دوانزە ساڵ بوو ئەو حەزرەتەش هەستی کرد بە ئازارو ماندوبونمان وەبۆ ئەوەی ئەو ئێش وئازارە لەسەرمان سووك بێت و پشوویەك بدەین هەندێك بەسەرهات و خەواریقی حەزرەتی حسامەدینی بۆ گێڕاینەوە کە لەو هاوینە هەوارەدا ڕوویاندابوو وەخودی حەزرەتی شێخ ئەحمەدیش (قدس سرهما) لەوکاتەدا ئامادەبوبو فەرمووی ئەم سەکۆیە نەزەرگای حەزرەتی حسامەدینە (قدس سره) وەلەو سەردەمەدا زۆربەی کاتەکان تەشریفی لێرەدا دادەنیشت هەروەها خەڵکێکی زۆر لەپەیرەوان و ئەولادەو میوانەکانی ئەو حەزرەتە لەخزمەتیدا دەهاتن بۆ ئێرە هەربۆیە چادرێکی زۆریان بۆ ئامادە دەکرا هەموو ڕۆژێك لەپاش نوێژی عەسر کاتێك دیاری کرابوو بۆئەوەی ئەولادەکانی

لەحزوریدا دەستەو نەزەر ڕابوەستن تاوەکو لەفەیزو بەرەکەتی ئەو حەزرەتە سوودمەند بن لەکۆتایی ئەو ماوە دیاری کراوەشدا چەند ئامۆژگاریەکی دەکردین و پاشان دەستمان زیارەت دەکردو لەخزمەتیدا مورەخەس دەبووین یەکێك لەگرنگترین ئامۆژگاریەکانی بەلای منەوە کە هەمیشە لەیادمەو هەوڵدەدەم جێبەجێی بکەم لەخۆمدا ئەوەیە کە فەرمووی ئەولادەکانم ئاگاداربن ئازاری دڵی موریدەکانم مەدەن سوێند بەخودا هەر ئەولادێکم بەناحەق ئازاری دڵی هەر موریدێکم بدات ئەوا هیچ سوودێکی مەعنەوی لەلایەن منەوە پێی ناگات و بەئەولادەی خۆمیشی نازانم.

حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) فەرمووی جەنگی جیهانی یەکەم هەڵگیرسابوو ڕۆژێکیان ئێمە لەخزمەت ئەو حەزرەتەداو لەم شوێنەدا ڕووبەڕوی ڕاوەستابووین پاش ماوەیەك پیاوێك هات کە زیارەتی ئەو حەزرەتە بکات وەدوو دارشەق لەبن باڵیدا بوو کەگوایە شەلە، حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) هەمیشە لەسەر لەباد (نەوگ) تەشریفی دادەنیشت هەروەها لەژێر لەبادەکەشدا دار حەیزەرانێکی دادەنا کاتێك پیاوە شەلەکە وویستی دەستی زیارەت بکات ئەو حەزرەتە دار حەیزەرانەکەی دەرهێناو دوو بۆ سێ داری پیاکێشاو فەرمووی نامەرد وادەزانی من جاسوسی ئینگلیزم ئاواخۆت شەلکردوە لەگەڵ ئەم فەرمایشتەی فەرموو پیاوەکە دارشەقەکانی فڕێداو بۆی دەرچوو دواتر بۆمان دەرکەوت کە ئەو پیاوە لەلایەن ئەڵمانەکانەوە نێردرابوو بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕاستی و دروستی کارو کرداری ئەو حەزرەتە.

لەڕاستیدا ئەو بەسەرهاتانە لەوکات و شوێنەداو لەدەمی موبارەکی حەزرەتی شێخ ئەحمەدەوە (قدس سره) سوودێکی ڕۆحی زۆری بەبەندە گەیاند وەتارادەیەك کاریگەر بوو بۆ کەم کردنەوەی ئازاری جەستەم.

ماوەیەك لەدوای تەواوبوونی فەرمایشتەكانی ئەو حەزرەتە خواردنی نیوەڕۆ ئامادەبوو كە بریتی بوو لە نانی ساجی و قوتویەكی ئاو لەوكاتەدا هەلیكۆپتێركی ئێرانی كە فڕۆكەیەكی جەنگی ڕژێم بەسەر سەریەوە تەقەی لێ دەكرد زۆر بەنزمی و لەنێوان شاخەكاندا بەسەر سەرماندا تێپەڕ بوو بەڕاستی فڕۆكەوانەكەی زۆر بوێرو لێهاتوو بوو كە بەوشێوەو لەماوەیەكی كەمدا توانی كۆنترۆڵی هەلیكۆپتەرەكەی بكات و ڕزگاری ببێت لەفڕۆكە جەنگیەكەی ڕژێم لەدوای ئەو ڕووداوە یەكسەر بەڕێ كەوتین و بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ گەیشتینە كەڕەجاڵ كە مەقەڕی پارتی لێ بوو ئەو شەوە لەوێ ماینەوە، نیوەشەو لەگەرمەی خەودا فڕۆكەكانی ڕژێم بەخەستی ئەو شاخانەیان بۆردومان كرد ئێمە لەوكاتەدا زۆر ترساین و ئارامی لێ هەڵگرتین سەرلەبەیانی لە كەڕەجاڵەوە بەڕێ كەوتین بەرەو كەلی دزڵی دوای ماوەیەك گەیشتین بە شیوێك كە مەقەڕی حزبی سۆسیالیستی لێ بوو كاتێك پێشمەرگەكان چاویان كەوت بە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) یەكسەر هەواڵیاندا بەئەوانەی كە لەناو مەقەڕەكەدا بوون و هەموویان هاتن بۆ پێشوازی، ئەوانەی كە لەیادم ماون حەمەی حاجی محمود سكرتێری ئەو حیزبەو حامیدی حاجی غالی بوون پاش سڵاوو ئەحواڵ پرسین نانوچای بەیانیان بۆ هێناین و ماوەیەكی كەم پشوماندا پاشان درێژەماندا بەڕۆیشتنەكەمان كە نزیك بووینەوە لەكەلی دزڵی بەهۆی بەرزی و سەختی ڕێگاكەیەوە خێزانی ئەو حەزرەتە یەجگار ماندوو بوبو وەقاچەكانی لەبەر زۆری ڕێكردن هەڵئاوسا بوو لەوكاتەدا سەربازێكی ئێرانی كە دوو هێستری پێبوو یەكێكیان بارێك میوەی هەڵگرتبوو وەئەوی دیكەیان هیچ بارێكی لەسەر نەبوو لەكەلەكەوە بەرەوخوار دەهات ئەو حەزرەتە داوای لێكرد تاوەكو هێسترێكمان پێ بدات بۆئەوەی خێزانی سواربێت و دوانەكەوێت بەڵام لەبەر بێ هێزی و ئازاری قاچەكانی نەیتوانی سواری هێسترەكە ببێت.

پاشان ئەو حەزرەتـە فـەرمووی مـن بەسـواری هێسـترەکە دەڕۆم بـەڵکو زووتـر لـەئێوە بگەمە سەر کەل و ئۆتۆمـبیلێك پەیدا بکەم کاتێك گەیشتینە ئەو شـوێنە لەبـەر مانـدوویی نەمـان دەتوانی لەوە زیـاتر هـەنگاو بنـێین و هـەر لەوشـوێنەدا خۆمانـدا بەسـەر زەویەکـەدا لەوکاتەداو لە نزیکمانەوە سوپای ئێران بە (تی ئێن تـی) شـاخەکەی دەتەقانـدەوە بۆئـەوەی ڕێگاکە فراوان بکات بۆ چوونە خوارەوەی تانکەکانی دوای ماوەیەك بەئێمەیان ووت دەبێت ئـەو شـوێنە چـۆڵ بکـەن تـاوەکو بـەهۆی ئـەو تەقینانـەوە زیانتـان پـێ نـەگات لـەکاتی ڕۆیشتنماندا سەربازێك هاواری کردو ووتی ڕژێم کیمیاوی وەشـاندوە بەسـەر ئەحمـەد ئـاوادا بەپەلە ڕاکەن و خۆتان ڕزگار بکـەن هەرچـەندە لەبەرمانـدووی ڕێگاکـە هێزمـان لێ بڕابـوو بەڵام هەرچۆن بوو خۆمان لەوشوێنە دەرباز کرد دواتر هەرلەو ڕێگەدا سێ پێشمەرگە بەرەو ڕوومان هاتن کە چاویان کـەوت بـەخێزانی حـەزرەتی شـێخ ئەحمـەد (قدس سره) ناسـیانەوەو یەکێکیان پێی ووت من برای شیری تۆم لەوکاتەدا زۆر یارمەتیان دایـن و ئەمبولانسـێکی سوپایان ڕاگرت، کۆمـەڵێك سەربازی دەگواستەوە بۆ دزڵێ کە بەهۆی کیمیاویەکەی ئەحمەد ئاواوە بریندار بوبون تاوەکو ئێمەش بگەیەنێتە ئەو گوندە.

بەهۆی سەختی و قەرەباڵغی ئۆتۆمبیل و ئاوارەکان کـە لەسـەر ئـەو ڕێگەیـە دروسـت بوبو ئیتر چاومان بە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) نەکەوتەوەو لێـك دابـڕاین کـە سـواری ئۆتۆمبیلەکە بووین من زۆر پەرێشان بووم بەهۆی ئازاری دەمو چاومـەوە نەمدەتوانی چـاوم بکەمـەوە وەئەگەر بمویستایە تەماشای شتێك بکەم دەبوایە بەپەنجـەکانم پێڵـوی چـاوم بـەرز بکردایەتەوە وەعـادلیش هەردەگریاو هاواری چاوی دەکردو حاڵی ئەو زۆر لەمن خـراپتر بـوو هەروەها بەیناوبەین لە خێزانی ئەو حەزرەتەشـی دەپرسـی کـەی بـاوکم دەدۆزینـەوە ئـەویش دەگریاو دەیوت عـادل گیان مـەگری زۆرمـان نەماوە بگەینە دزڵێ لەوێ باوکت دەدۆزینـەوە،

لەوکاتەدا یەکێك لەسەربازە بریندارەکان کیسەیەك چەرەساتی دابەدەستمەوە بەڵام بەهۆی ئێشو ئازاری چاومەوە نەمدەتوانی بەچاکی بیبینم دڵم خۆش بوو وامزانی نانە چونکە زۆرم برسی بوو لەبەرئەوەی ئەو ڕۆژە تەنها نانی بەیانیمان خواردبوو وەکاتەکانی دیکەش هەرنانی ساجیمان دەخوار کە زۆر سوێربوو کاتێك کیسەکەم کردەوەو تۆزێکم لێ خوارد ئەوجا زانیم کە چەرەسە وەلەبەر زۆری ماندووی و برسیەتی ئاگام لەوانی تر نەمابوو.

پێش ئەوەی بگەینە گوندی دزڵی ئەمبوڵانسەکە لەکارکەوت و بۆماوەیەك لەوێدا چاوەڕێ بووین لەناکاودا میك زەمینیەکی سوپا پەیدابوو دووسەربازی تێدابوو ئێمەیان سواری ئەو میك زەمینیە کردو بەرەو دزڵی کەوتینە ڕێ کاتێك گەیشتینە ئەو گوندە نەخۆشخانەیەکی بچووکی تێدابوو کە پڕبوو لەئاوارە وەهەندێك پزیشکی سەربازی چارەسەری کیمیاویان بۆ بەکاردەهێنان کە بریتی بوو لە ئەمپولێکی پرتەقاڵی ڕەنگ، پاش وەرگرتنی چارەسەری کیمیاوی بەئۆتۆمبیلێکی دیکەی سوپا گواستینیانەوە بۆ شارۆچکەی سەوڵئاواو لەوێشەوە بە ئوتوبوس بەرەو شارۆچکەی شوێشە بەڕێ کەوتین تائەوکاتە بەهیچ شێوەیەك هەواڵی حەزرەتی شێخ ئەحمەدمان (قدس سره) نەدەزانی هەروەها ماندووبون و شەکەتی زاڵبوبو بەسەر جەستەو دەروونماندا بەشێوەیەك کە بیرو هۆشی لەکار خستبووین.

کاتێك گەیشتینە ئەو شارۆچکەیە بردینیان بۆ قوتابخانەیەك بۆئەوەی تابەیانی لەوێدا بخەوین سەرلەبەیانی هەموو ئاوارەکانیان لەدەرەوەی قوتابخانەکە کۆکردەوەو پێیان ڕاگەیاندین ئامادەبن ئێستا دەتانبەین بۆ ئۆردوگا لەوکاتەدا هەندێك ئافرەتمان چاو پێکەوت کە یەکێکیان ئێمەی دەناسی هات بۆلامان پاش سڵاوو هەندێك گفتوگۆ خێزانی

حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لێی پرسی تۆ ژیانی کچی (شێخ عەفان)[٢٩] یت؟ لەوەڵامدا ووتی بەڵێ.

ژیان خان لەشاری هەڵەبجە مامۆستا بوو وەلەڕێی ئەحمەدئاواوە لەگەڵ دوو مامۆستای ئافرەتی هاوڕێیدا ئاوارە بوبو، هەرلەوێدا بڕیارماندا کە بۆ هەرشوێنێك بمانبەن ئەوانیش لەگەڵ خۆماندا ببەین لەوکاتەدا پاسەکان ئامادەبوون و ئێمەیان برد بۆ ئۆردوگای (شوێشە) کە دۆڵێك بوو لە نێوان ئەو شارۆچکەیە و گوندی نگڵدا دواتر زانیمان کە ئەو شوێنە موڵکی (شێخ محمودی کوڕی شێخ عوبەیداللە)ی برازای حەزرەتی حسامەدینە (قدس سره) کە دەوڵەتی ئێران لێی وەرگرتبوو بۆ ئاوارەکانی هەڵەبجە.

پاش ماوەیەك لەگەیشتنمان بەو ئۆردوگایە پیاوێکی ڕیش سپی کە چەند پیاوێکی دیکە لەپشت سەریەوە بوو هات بۆلای ئێمەو سڵاوی کردو بەحەرەمی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی (قدس سره) فەرموو براژن بەخێر بێیت حاڵتان چۆنە ئەی کاکەم تەشریفی لەکوێیە؟ ئێمە نەمان ناسیەوە بەڵام بەدیعە خانمی حەرەمی ئەو حەزرەتە ناسیەوەو لێی پرسی شێخ کەمال ئەوە بۆ ئاوا زوو پیربوویت پاش هەندێك گفتوگۆ لەگەڵ جەنابیاندا بەدیعە خانم زۆر دڵ تەنگ بوو بەهۆی نەزانینی هەواڵی ئەو حەزرەتەو هەروەها بێ جێگەی و ئاوارەبونمانەوە، ئەوکاتە ماڵی جەنابی شێخ کەمال (خودا بیپارێزێت) لەگوندی نگڵدا بوو چەند کەسێکیان نارد تاوەکو لەو گوندەوە خواردنی نیوەڕۆمان بۆ بهێنن، دوای نانی نیوەڕۆ هەواڵمان پێگەیشت کەوا حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) هەندێك لە موریدەکانی لە خزمەتیدان و بەئۆردوگاکانی دەربەند دزلی و هەزارخانیدا گەڕاون

---

[٢٩] مەرحومی شێخ عەفان کوڕی مەرحومی حاجی شێخ عوسمان و نەوەی حەزرەتی حسامەدینە (قدس سره) ......... نووسەر

بەشوێن ئێمەداو ئێستاش هەواڵی ئێمەیان پێگەیشتوەو بەڕێ کەوتوون بەرەو لای ئێمە.

پاش نوێژی عەسر تەشریفی گەیشتە ئۆردوگای شوێشەو قەرەباڵغیەکی زۆر لەموریدەکانی مەریوان و دزڵی و ژاوەرۆو نگڵ لەخزمەتیدا بوون بەندەو عادل هەرکە چاومان بەو حەزرەتە کەوت بەپەلە چووین بۆ پێشوازی و هەردوو دەستی موبارەکیمان زیارەت کرد. موریدەکانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) کەچاویان بەو ڕێزو ئەدەبەمان کەوت فرمێسك بەچاویاندا هاتە خوارەوە وەبەمەحەبەت و دڵ گەرمیەوە باوەشیان بەبەندەو عادلدا کردو سەروچاویان ماچ کردین چونکە هاوشێوەی ئەو ئەدەبو ڕێزەی کە لەئێمەیان بینی لەناو ئەولادەی مەشایخەکانی دیکەدا زۆر دەگمەن بوو یان هەر بوونی نەبوو وەلەڕاستیدا ئەو خوڕەوشتە جوانانەمان لەسایەی پەروەردە بەهادارەکانی ئەو حەزرەتەوە بەدەست هێنابوو.

لەوماوەیەی کە لەو ئۆردوگادا بووین جارێکیان عەرزمان کرد قوربان لەسەر کەلی دزڵی چاوەڕێی جەنابت بووین تالە خزمەتتدا بەرەو دزڵی بەرێکەوین بەڵام نەماندۆزیتەوە بەوهۆیەوە یەجگار نائومێدو غەمبار بووین. فەرمووی کەگەیشتمە سەرکەل گەیشتم بەچەند ئۆتۆمبیلێکی سوپای ئێران داوام لێ کردن کە بۆ ماوەیەك چاوەڕوان بن تاوەکو ئێوە دەگەن بەڵام بەهۆی جەنجاڵی ئاوارەکان و ڕیز بەستنی ئۆتۆمبیلەکانەوە دەرفەتی وەستان نەبوو لەوکاتەدا یەکێك لە

شۆفێرەکان پێی ووتم خۆت ماندوو مەکە ئەم کارەت بێ سوودە وەخەمیان مەخۆ هەموویان دەگەنە دزڵی لەوێ یەکتر دەدۆزنەوە لەبەرئەوە تەشریف بێنە لەگەڵ ئێمەدا تابتگەیەنینە ئەو گوندە.

کاتێك گەیشتمە گوندی دزڵی چاوم کەوت بەهەندێك لە موریدەکانی حەزرەتی حسامەدین[٣٠] (قدس سره) کە بەئەو دیدارە زۆر خۆشحاڵ و شادمان بوون هەربۆیە یەکسەر چواردەوریان گرتم و هەواڵی گەیشتنی منیان بۆ موریدەکانی دیکە نارد وەلەماوەیەکی کەمدا هەموویان هاتن بۆ پێشوازیم لەوکاتەدا بەهۆی قەرەباڵغی موریدەکانەوە دەرفەتم نەبوو چاوەڕێتان بکەم پاشان چووم بۆ ماڵی یەکێك لەو موریدانە بەناوی حەمە ساڵحی حاجی سلێمان وەباسی ئێوەم بۆ کردن کە لە سەرکەل بەجێم هێشتوون ئەوانیش ووتیان لەم ناوچەیەدا کۆمەڵێك ئۆردوگا لەلایەن حکومەتەوە دامەزراوەو هەموو ئاوارەکان لەو ئۆردوگایانەدا نیشتەجێ دەکەرێن جالەبەرئەوە هیچ خەمت نەبێت ئیمشەو پشووی خۆت وەرگرەو انشاالله سبەی لە خزمەتتدا دەڕۆین بۆ ئەو ئۆردوگایانەو دەیاندۆزینەوە لەکاتی گەڕانماندا هەواڵی ئێوەیان بۆ هێناین کە لێرەدا نیشتەجێ بوونە هەرئەوکاتە بەڕێ کەوتین و هاتین بۆلاتان.

بۆماوەی سێ ڕۆژ لە ئۆردوگای شوێشە لەژێر چادردا دەژیاین وەمیوانێکی زۆر لەموریدو مەنسوبەکانی ژاوەرۆو نگلّ و میانەو بەرقڕو سنە دەهاتن بۆ زیارەتی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بەجۆرێك ئەو ئۆردوگایە لەبەر قەرەباڵغی موریدەکانی جمەی دەهات وەئاوارەکان بەزەحمەت دەیانتوانی هاتوچۆ بکەن.

---

[٣٠] لەو سەردەمەدا زۆربەی دانیشتوانی ئەو گوندە موریدو مەنسوبی ئەو حەزرەتە بوون ..................... نووسەر.

## ( ئامادەکاری گواستنەوەی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بۆ ئۆردوگای کامیاران و شاری سنە )

بەهۆی ئەو قەرەباڵغیەی کە موریدو مەنسوبەکانی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بەمەبەستی زیارەت و بەخێرهێنانی دروستیان کردبوو لەو ئۆردوگایەدا حکومەت ناچاربوو پلانێك بگرێتەبەر بۆئەوەی ئاسانتر ئەو ئۆردوگایە بەڕێوەببات و ئاوارەکانیش بەبێ کێشە ژیان بەسەر بەرن سەرئەنجام بڕیاریدا بەگواستنەوەی ئەو حەزرەتەو ماڵ و منداڵی بۆ ئۆردوگای کامیاران پاش نوێژی مەغریب بەرپرسانی ئۆردوگای شوێشە هاتنە خزمەتی و هەواڵی گواستنەوەکەیان پێ ڕاگەیاند وەلەماوەی کاتژمێرێکدا هەموو کەلوپەلەکان کۆکرانەوەو بە ئۆتۆمبیلی حکومی بەڕێ کەوتین بۆ ئۆردوگای کامیاران ئەوکاتەی کە گەیشتینە شاری سنە نیوەشەو بوو شێخ مەحمودی کوڕی شێخ عوبەیداللە داوای لەبەرپرسەکان کرد کە ڕێگەبدەن تاوەکو بۆ خەوتن لەماڵیان بمێنینەوە وەبەڵێنی پێدان کە سەرلەبەیانی خۆی دەمان گەیەنێتە ئەو ئۆردوگایە ئەوانیش بەو پێشنیارەی ڕازی بوون.

بۆ ڕۆژی دوایی گەیشتینە ئۆردوگاکەو پاشان بردینیان بۆ ئەو بەشەی کە پرسگەی هەبوو وەچواردەوری تەلبەن کرابوو ئەوەبوو بۆماوەی مانگێك لەوشوێنەدا ماینەوە وەلەو ماوەیەدا دووبارە قەرەباڵغی دروست بوویەوەو موریدەکانی ئەو حەزرەتە بەبێ وچان و بەجۆشو خرۆشێکی زۆرەوە دەهاتن بۆ زیارەت هەرچەندە پاسەوان و سەربازەکان هەوڵیان دەدا کە ئەو قەرەباڵغیە دروست نەبێت بەڵام بەهۆی شەوق و مەحەبەتی زۆری موریدەکانەوە ئەوکارەیان بێ سوود بوو وەلە کۆنترۆڵیاندا نەمابوو.

هەربۆیە دووبارە دەوڵەتی ئێران ناچاربوو بەوەی کە بڕیارێکی دیکە بدات لەبارەی نیشتەجێ کردنی ئەو حەزرەتەوە بەوهۆیەوە لەگەڵ هەندێك لەو موریدانەی کە دۆستی

دەوڵەت بوون لەوبارەیەوە مەشوەرەتی ئەنجامدا تاوەکو بگەنە چارەسەرێکی گونجاو بۆ ئەو کێشەیەی ڕوبەڕویان بوەتەوە وەبتوانن شوێنێك دیاری بکەن کە زۆر ئەو قەرەباڵغیەی تێدا دەرنەکەوێت ئەوەبوو لەکۆتاییدا گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە دەبێت ئەو حەزرەتە لە شاری سنەدا نیشتەجێ بکرێت.

پانزە ڕۆژ لەمانگی پیرۆزی ڕەمەزان مابوو کۆمەڵێك لەموریدەکان هاتن بۆ ئۆردوگاکەو عەرزی ئەو حەزرەتەیان کرد کە دەبێت لەمڕۆ بەدواوە تەشریف بهێنیت بۆ سنەو لەوێ نیشتەجێ ببیت ئەوەبوو لە مەراسیمێکی سادەو بچوکدا بەئامادەبونی ئەو کۆمەڵەو هەندێك لە خزمو کەسی ئەو حەزرەتە بەرەو شاری سنە بەڕێ کەوتین پاش ئەوەی گەیشتینە ئەو شارە بۆماوەی هەفتەیەك لەماڵی هەندێك خزمو کەسوکاردا ماینەوەو هەرشەوەو بانگهێشتی ماڵێك دەکراین تائەو کاتەی خانوویەکیان بەکرێ بۆ پەیداکردین لەگەڕەکی خەسراوا بەرامبەر بە عیمارەت و لە تەنیشت گۆڕستانی شێخ حەمە باقردا.

لەماوەی ئەو هەفتەیەدا بەرپرسێکی ئیداری بەناوی ئاغای هەراتی کە جێگری پارێزگاری سنە بوو هاتە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) کە ئەوکاتە لەماڵی شێخ مەحمود دەعوەت بووین لەدوای هەندێك گفتوگۆو پرسیارو وەڵام خۆی بەو حەزرەتە ناساندو عەرزی کرد ئیتر لە ئێستاوە بەرپرسیارێتی کاروباری جەنابت لەئەستۆی مندایە وەهەر فەرمانێکت هەبوو بەمنی ڕابگەیەنە تاوەکو بۆتانی ئەنجام بدەم.

ئەو حەزرەتەش زۆر دۆعای خێری بۆ کردو فەرمووی لەئێستادا کەلوپەلی ناو ماڵمان لە هەڵەبجە بەجێ ماوەو چەند ڕۆژێکی تریش خانوومان بۆ پەیدادەکەن بەکرێ وەبەبێ کەلوپەل و ڕاخەر لە خانووی چۆڵدا ژیان ناکرێت ئەگەر دەوڵەت چەند بارهەڵگرێکمان پێ

بدات بۆ ئەو مەبەستە زۆر سوپاس گوزار دەبین هەروەها (مەحاسینی شەریف)[31] لەسەرمەرقەدی حەزرەتی سراجەدین و بەهائەدینە (قدس سرهما) لەگوندی تەوێڵە وەمن سەرپەرشتی مەحاسین و ئەو مەرقەدانە بووم لەوانەیە ئێستا سەربازەکان وابزانن ئەو سندوقەی کە مەحاسینی تێدایە پڕە لە پارەو پوول و بیشکێنن پاشان لەناوی بەرن بۆئەوەی لەو بێ ڕێزیە پارێزراو بێت بەڵکو ڕێگەیان پێ بدەن لەکاتی گەڕانەوەیاندا بڕۆن بۆ ئەو مەرقەدانەو لەخزمەت مەحاسیندا بگەڕێنەوە بۆ شاری سنە کە ئەو حەزرەتە کۆتایی هێنا بە فەرمایشتەکانی ئاغای هەراتی بەمەحەبەت و شەوقێکی فراوانەوە عەرزی کرد فەرمانەکەت جێ بەجێ دەکەین وەمن بۆ خۆمیش لەگەڵ ئەو بارهەڵگرانەدا دەڕۆم بۆ ئەوەی هیچ کێشەیەکیان بۆ پێش نەیەت بەڵام چەند بارهەڵگرتان پێویستە بۆ گواستنەوەی کەلوپەلەکان تاوەکو لەپارێزگاوە ئامادە بکرێن؟ ئەو حەزرەتەش لەوەڵامدا فەرمووی من لەوبوارەدا شارەزا نیم عبدالرحمانی کوڕم لەو جۆرە کارانەدا تەجروبەی زۆری هەیە لەو بپرسن.

---

[31] (مەحاسینی شەریف) پێکهاتووە لە چوار تاڵ مووی ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیەوسلم)، لەسەردەمی سەڵتەنەتی عوسمانیدا مەرحومی شێخ ئەحمەد شەمسەدینی کوڕی حەزرەتی سراجەدین (قدس سرهما) تەشریف دەبات بۆ ئیستەمبوڵ و لەلایەن سوڵتان (عبدالحمید)ەوە مەحاسینی شەریفی پێ دەبەخشرێت کە بریتی بووە لە حەوت تاڵ مووی ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستان سێ لەو تاڵە پیرۆزانە دەبەخشێت بەمەرقەدی حەزرەتی ضیائەدین لەبیارەو چوارەکەی دیکەشی دەبەخشێت بە مەرقەدی حەزرەتی بەهائەدین لەتەوێڵە. لەکتێبی (سەربوردێکی هەورامان و سەردانێکی تەوێڵە) لەنووسینی مامۆستا عبدالرزاق عبدالرحماندا ئەم بابەتە بەدورو درێژی باس کراوە ......................... نووسەر.

لەپاش دوو ڕۆژ لەدەرچوونی بارهەڵگرەکان بۆ هەڵەبجە، لەماڵی شێخ عەلی کوڕی شێخ عوبەیداللە دەعوەت بووین دەمەو ئێوارە بوو لەناکاودا ئاغای هەراتی بە ماندووی و شپرزیەکی زۆرەوە کە بەسیمایەوە دیاربوو هاتە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەدو (قدس سره) پاش عەرزی سڵاوو خەبەر پرسین ئەو حەزرەتە لێی پرسی ئاغای هەراتی ماندونەبیت چیە بۆ واخەمبارو شڵەژاویت؟ لەوەڵامدا عەرزی کرد قوربان کەلوپەلی ماڵەکەمان بارکرد بەهەموویەوە پڕی سێ بارهەڵگر بوو بەڵام بەمنیان ووتبوو کە پڕی شەش بارهەڵگر کەلوپەل و تفاقی خانەقاو ماڵەکەتانە بەوهۆیەوە زۆر گەڕاین بەناو هەڵەبجەدا، وەئێستاش من بەرپرسم لەوبارەیەوەو دەبێت باجەکەی بدەم بەدەوڵەت بەبیستنی ئەم هەواڵە ئەو حەزرەتە بێ ئەندازە تورەو غەمباربوو بەڵام تازە کارلەکار ترازابوو وەلەوکاتەدا هیچ چارەیەك نەبوو. پاشان حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەبارەی مەحاسینەوە لێی پرسی ئایا لەشوێنی خۆیدا مابوو وەتوانیتان بیهێننەوە بۆ ئێرە؟ عەرزی کرد بەڵێ بەڵام ئێستا لە باڵەخانەی پارێزگا دانراوە پاش ئەوەی کە چوونە ناو خانووەکەی خۆتان و کەلوپەلەکەتان ڕاخست ئەوا لەمەراسیمێکدا دەیگەڕێنینەوە بۆ جەنابتان.

لەکاتی ڕاخستنی کەلوپەلەکاندا ئەو حەزرەتە بە حاجی سدیقی میری کە شۆفێری تایبەتی و موریدێکی دڵسۆزی بوو فەرمووی زۆر یادی جەنابی شێخ موعتەسەمی مامم دەکەم لەوکاتەوەی کە بەئاوارەیی گەیشتومەتە ڕۆژهەڵاتی کوردستان نەمتوانیوە چاوم پێی بکەوێت لەبەرئەوە بۆ نیو کاتژمێریش بێت سەردانی دەکەم، لەو سەردانەیدا بێجگەلە حاجی سدیقی میری حاجی عبداللەی باوەرێزی و شێخ زاهیدی حسامی کە خەلیفەی ئەو حەزرەتە بوون لەخزمەتیدا ڕۆیشتن، پاش گەڕانەوەیان فەرمووی کە بەوشێوەیە چاوم بە مامم کەوت ئاوەها بێ نازو بێ خزمەت بوو بێ ئەندازە خەمبار بووم.

پـاش تـەواوبونی ڕاخسـتن و ڕێکوپێـك کردنـی کەلوپەلـەکانی نـاو مـاڵ ژورێـك لەخانوەکەدا دیاری کرا وەك خانەقا بـۆ پێشـوازی لـە موریـدو مەنسـوبو میوانـەکانی ئـەو حەزرەتە وەلە ماوەیەکی کورتیشدا خەتمەو تەهلیلەو زکری تیادا دامـەزراو کۆمـەڵێکی زۆر لەپەیڕەوانی ڕێبازی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) شەوانی سێشـەمەو هـەینی دەهـاتن بـۆ بەشداری کردن لەمەراسیمی خەتمەو ئادابەکانی تەریقەت.

سەرلەبەیانیەك لەکۆتا مانگی وەرزی بەهاری ئەو ساڵەدا حـاجی عبـداللەی بـاوەرێزی هاتـە خزمـەت حـەزرەتی شـێخ ئەحمـەدو (قـدس سـره) عـەرزی کـرد قوربـان جـەنابی شـێخ موعتەسەمی مامت (بەرەحمەت بێت) لەدونیا دەرچوو بەبیستنی ئـەو هەواڵـە زۆر خـەمباربوو وەیەکسەر فرمێسك بەچاوی موبارەکیدا هاتە خـوارەوە لەحاڵێکـدا کـە بـەپێوە ڕاوەسـتابوو بەڵام بەهۆی تەئسیری ئەو هەواڵە بەپەلە خۆی بەدیواری خانەقاوە گرتـەوە پاشـان فـەرمووی بەزووی تەلەفون بکەن بۆ حاجی سدیق با ئامادەبێت و بڕۆین بۆ ماڵی مامـم. بـۆ دەمـەو ئێوارە تەشریفی گەڕایەوە بەڵام ڕوخساری موبارەکی تێکچوو بوو وەزۆر لاوازبوبو هـەروەها هەستی بەئازارێکی زۆر دەکرد لەپشتیدا لەوکاتەدا حاجی عبداللە و جەنابی شێخ کـەمالی برای چووبونە ژێر باڵی، حەرەمی عەرزی کرد قوربان چی ڕوویداوە بـۆ ئـاوا بـەئازارو لاواز بوویتە؟

ئەو حەزرەتەش فەرمووی کاتێك گەیشتمە ماڵی مامـم چـوومە ئـەو ژوورەی تـەرمی جەنابی تێدابوو کە چاوم بەڕوخساری مامەم کەوت زۆر دڵم پڕبوو ئابەوشێوە بـە غـەریبی و بێ نازی کۆچی دوایی کرد لەوکاتەدا ویستم دەستی زیارەت بکـەم کـە دانەویمـەوە بـۆ ئـەو کـارە ئێشـێکی بـەزەبر گەیـەنرا بەپشـتم وەتائـەو کاتـەی تەرمەکـەمان ئەسـپەردە کـردو بەئێستاشەوە ئەو ئازارە هەرلە پشتمدا ماوەتەوەو باوەڕناکـەم ڕزگـارم بـێ لێـی. بەبیسـتنی

فەرمایشتی ئەو حەزرەتـە زۆر دڵگـران بـووین هەربۆیـە هەمیشـە ترسـی لەدەسـتدانی ئـەو حەزرەتە لە دڵماندا بوو.

هەرچەندە ئەو ئازارە درێژەی خایاند بەڵام حەزرەتی شـێخ ئەحمـەد (قدس سره) یـەجگار خۆڕاگرو پشوو درێژ بـوو وەبـەو ئێشـو ئازارەشـەوە ئـەرك و بەرپرسـیاریەتی خـۆی بەباشـی ڕادەپەڕاند. هەرلەو ڕۆژانەدا هەواڵی ئەوە بڵاوبویەوە کەوا جەنابی شێخ موعتەسەم (بەڕەحمـەت بێت) وەسیەتی کردوە شێخ سەلاحی کوڕی جێگەدار بێت.

لەڕۆژی سێهەم و کۆتایی تەعزیەکەدا (لەشاری سـنەدا عـورف وایـە کـە سەرەخۆشـی سێ ڕۆژە) وەلەپاش کۆتـایی هـاتنی تەعزیـەی پیـاوان حـەزرەتی شـێخ ئەحمـەد (قدس سره) فەرمووی دەبێت بڕۆم بۆ مـاڵی مـامەم و سەرەخۆشی لەخێزان و منداڵـەکانی بکـەم (وەکـو نەریتێکی باوی کـوردەواری) ئەوکاتـە بەنـدە لەخزمـەتیـدا بـووم کاتێـك چـووینە ماڵیـان، وەپڕبوو لە ژن و خاوخێزان کە بەمەبەستی سەرەخۆشی هاتبوون پـاش مـاوەیـەك کچـەکانی مەرحومی شێخ موعتەسەم عەرزیان کرد قوربان تەشریف بهێنە بـۆ ئـەم حوجرەیـە (کەلـە تەنیشت هۆڵی ماڵەکەیاندا بوو) بەنـدەو جـەنابی شـێخ کـەمال و هەنـدێك لەئـەولادەکانی جـەنابی (شـێخ موعتەسـەم)یش (بەڕەحمـەت بێت) لەخزمـەتیـدا چـووینە حوجرەکـەوە پاشـان کچەکان عەرزیان کرد قوربـان جـەنابت ڕیـش سـپی و گـەورەمانیت وەئـەو خەڵکـەش ڕێـز لەجەنابت دەگرن و فەرمایشتەکانت جێ بەجێ دەکەن، وەلەڕاستیدا ئەوانەی کە ئێسـتا ئـەم قەرەباڵغیـەیان دروسـت کـردوە زۆر بەدەمانـەوە بـوون و مانـدوبوون بـەهۆی دەربڕینـی هاوخەمیـەوە لـەماوەی ئـەم تەعزیـەدا ئێسـتاش داوا لەجـەنابت دەکـەین کـە کۆتـایی ئـەم مەراسیمەیان پێ ڕابگەیەنیت و بفەرمویت سەرەخۆشـی تـەواوبوەو هەرکەسـەو بگەڕێتـەوە ماڵی خۆی تاوەکو ئێمەش و ئەوانیش کەمێك بحەوێینەوە.

لەوەڵامیاندا فەرمووی هەرچەندە ئەم کارە باش نیە بۆ ئێمە وەدەبێت موریدەکان ئەو قسەیە ڕابگەیەنن بەڵام لەبەرخاتری ئەوەی کە ئێوە زۆر ماندوون و پێداگری دەکەن لەسەر ئەوەی من ئەم قسەیان پیێ ڕابگەیەنم ئەوا دڵی ئێوە ناشکێنم و ئەوکارە دەگرمە ئەستۆ. پاش چەند ڕۆژێك لەکۆتایی هاتنی تەعزیەکە هەواڵمان پێگەیشت کە خەڵکانێك (خودا جەزایان بداتەوە) دەنگۆی ئەوەیان بەناو خەڵکدا بڵاوکردوەتەوە کە گوایە ئەو حەزرەتە خۆی ئەو فەرمایشتەی کردوەو هیچ کەس لەبنەماڵەی مەرحومی شێخ موعتەسەم داوای کۆتایی هێنان بە تەعزیەکەیان لیێ نەکردوە.

بەداخەوە بەهۆی ئاوارە بوون و تازە نیشتەجیێ بونمان لەشاری سنەدا بەندە دەرفەتم بۆ نەڕەخسا کە بگەمە خزمەت جەنابی شێخ موعتەسەم (بەڕەحمەت بێت) وەئەوەبوو لەدوای دوو بۆ سیێ مانگ لە ئاوارە بوونمان کۆچی دوایی کرد بەڵام هەندێك لە موریدەکانی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لە سنەدا خورەوشت و سەرگوزەشتەی مەرحومیان بۆ گێڕامەوە لەوانەی کە زۆر گرنگ بوون بۆ من (خاکی بوون و خۆ بەزل نەزانین هەروەها خۆش مەجلیسی و قسەزانی جەنابیان بوو).

خۆشبەختانە لەساڵی (١٩٩٧)ی زاینیدا کە سەفەری دووهەمی ئێرشادم بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەست پێکرد (واتە ساڵێك پاش گەڕانەوەم بۆ هەڵەبجە) لەوسەفەرەداو لەشاری سەقز گەیشتمە خزمەت یەکێك لە دۆستە نزیکەکانی مەرحومی شێخ موعتەسەم کە زۆرێك لە خورەوشتە بەرزەکانی مەرحومیان بوبون بە سروشتی و لەهەڵسوکەوتیدا ڕەنگی دابویەوە ئەویش جەنابی خەلیفە عەباسی ڕەزاییەیە (خودا بیپارێزێت) کە لەشاری بانەو هەندێك ناوچەی دیکەی ئێراندا خانەقاو موریدو مەنسوبێکی زۆری حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لەخزمەتیدایە.

وەتەنها کەسێك وەك نوێنەری جەنابی شێخ موعتەسەم (بەڕەحمەت بێت) کەلەو سەفەرەی ڕۆژهەڵاتدا بەقەرەباڵغیەکی زۆری موریدو مەنسوبەوە هات بۆ پێشوازیم جەنابی خەلیفە ڕەزایی بوو (خودا بیپارێزێت). پاشان بانگهێشتی کردین بۆ خانەقای بانەو خوانێکی گەورەو فراوانی بۆ هەموو ئەو موریدانەی کە لەگەڵمدا هاتبوون ئامادە کردبوو، لەو سەفەرەمدا بۆ یەکەمجار بوو کە بەدیداری جەنابیان ئاشنابم بەڕاستی شاگردو دۆستی ڕاستەقینەی جەنابی شێخ موعتەسەم بوو (بەڕەحمەت بێت) کە خاوەنی هەموو ئەو سیفاتە بەرزانەی جەنابیان بوو کە پێشتر باسمان کرد.

شایانی باسە مەرحومی شێخ موعتەسەم لەمەراسیمێکی شایستەدا لەگۆڕستانی گوندی سەلەوات ئاوای سەر بەشاری سنە بەخاك سپێردراوە.

## ( ئەو سەفەرانەی کە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) پێش وەفاتی بەمەبەستی ئیرشاد ئەنجامی دابوون )

لەپاش نیشتەجێ بوونمان لەشاری سنەدا هاوولاتیانی ناوچەکانی دیکەی ڕۆژهەلاتی کوردستان دەهاتنە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بەمەبەستی بەخێر هاتن و پیرۆزبای نیشتەجێ بوونی لەوشارەدا هەروەها شەوق و ئارەزوویەکی زۆریشیان لەحزوریدا دەردەبڕی بۆئەوەی کە تەشریف ببات بۆ سەردانی ئیرشادی ناوچەکانیان چونکە ماوەیەکی زۆر تێپەڕی بوو بەسەر یەکەمین ئیرشادیدا.

لەناوەڕاستی وەرزی هاوینی هەمان ساڵی ئاوارەبوونمان بڕیاریدا تەشریف ببات بۆ شاری پاوە هەروەها حەرەمی و منداڵەکانیشی لەخزمەتیدا بوون ئەوەش بەهۆی ئەو مەحەبەت و ئیخلاسەی کە هاوولاتیانی ئەو سەردەمەی پاوە هەیانبوو لەبەرامبەریاندا. دوای ماوەیەك لەبەڕێ کەوتنمان و بەجێ هێشتنی شاری ڕەوانسەر گەیشتین بە قەرەباڵغیەکی زۆری موریدو مەنسوبەکانی پاوە کە هاتبوون بۆ پێشوازی ئەو حەزرەتە، پاش زیارەت و بەخێرهێنان لەلایەن خەلیفە ئەحمەدی حسامی[٣٢] و (بەڕەحمەت بێت) موریدەکانەوە بەڕێکەوتین بەرەو پاوە کاتێك گەیشتینە خانەقای حەزرەتی حسامەدین لەوشارەدا مەرحومی خەلیفە ئەحمەد عەرزی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی (قدس سرهما) کرد قوربان هەرئەوکاتەی کە لەهەڵەبجەوە پەیامەکەت بۆ ناردین و فەرمووت دەبێت خانەقای حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) لەپاوە دروست بکەین بەبێ ووچان دەست بەکاربووین بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکەی جەنابت و منیش بەشێك لەباخەکەمم جیاکردەوە بۆ خانەقاو

---

[٣٢] خەلیفەی حەزرەتی بەهائەدینی دووهەم (قدس سره) بوو لەشاری پاوەو دەورووبەری .................. نووسەر.

هەروەها موریدەکان بەهەموو شێوەیەك هاوکاریان کردم تاتوانیمان ئەم خانەقایە دروست بکەین. کاتێك چووینە ناو خانەقاکەوە ئەو حەزرەتە زۆر شادمان بوو بەبینینی وەسوپاسی خودای مەزنی کردو دەست خۆشی لەمەرحومی خەلیفەو موریدەکان کرد بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە پیرۆزەیان.

ئەو حەزرەتە بۆماوەی دوو ڕۆژ لەخانەقای پاوەدا مایەوەو هاووڵاتیانی ئەو شارەش بەگشتی و ئەهلی تەریقەت و موریدەکانی ڕێبازی حسامی نەقشبەندی بەتایبەتی دەستە دەستە دەهاتنە خزمەتی بەمەبەستی زیارەت و بەدەست هێنانی فەیزو بەرەکەت، سەرلەبەیانی دووهەم ڕۆژی ئیرشادەکەی کۆمەڵێك زانای ئاینی هاتن بۆ خزمەتی ئەو حەزرەتە کە دواتر بەندە ئاگادار کرام لەوەی ئەو کۆمەڵە زانایە پێشتر ڕاوێژیان کردبوو لەبارەی ئەوەی کە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) تەمەنی بەرەو پیری دەڕوات و هەروەها هەواڵی ئازارە کاریگەرەکەی پشتیشی بەوان گەیشتبوو هەربۆیە بڕیاریاندا کە کەسێك وەك نوێنەری خۆیان دیاری بکەن کە بابەتی جێگەداری عەرز بکات تاوەکو وەڵامێکیان دەستکەوێت لەبەرئەوە پێویست بوو ئەو حەزرەتە پێش وەفات کردنی جێگەدارێك بۆخۆی دەستنیشان بکات تاکێشەو گومان بۆ پەیڕەوانی دروست نەبێت.

لەوکاتەدا بەندەو عادلی برایشم لەتەنیشت ئەو حەزرەتەوە دانیشتبووین یەکێك لەزاناکان کە ڕیش سپیان بوو ئەو بابەتەی عەرزکردو فەرمووی قوربان هەموومان دەبێت ئەم جیهانە بەجێ بهێڵین و ژیان تاسەر بۆ کەس نامێنێت جەنابیشت چەرمەسەری و ئێش وئازاری زۆرت پێ گەیشتووە لەلایەن بێ باوەڕان و ناحەزانەوە هەرچەندە ئێمە ئاواتە خوازین کە خودای مەزن تەمەن درێژو سەلامەتتان بکات بۆ گەیاندنی خزمەت بەڕێبازی پیرۆزی (نەقشبەندی و قادری) بەڵام پێویستە هەمیشە موریدو پەیڕەوانتان دڵشادو

ئومێدەوار بکەن و جێگەدار بۆ خۆتان دیاری بکەن، ئایا لەئەولادەکانت کەسیان شیاوی ئەوەن کە جێگەی جەنابت بگرنەوە وەکەسیانت بەجێگەداری خۆت دەستنیشان کردوە؟

لەوەڵامدا بەحاڵەتێکی پڕ لەغەم و نائومێدیەوە فەرمووی تاوەکو ئێستا هیچ کام لە ئەولادەکانم لەسەر ڕێبازو بیروباوەڕی من نین وەلەوبوارەدا بەهیچ شێوەیەك کاریان نەکردوە وەتەنها ئەم دووانە ماون لەناویاندا کە ئەوەش دواتر دەردەکەوێت ئایا شیاوبن بۆ ڕۆشن کردنەوەی چرای تەریقەتەکەم یان نا، باچاوەڕێ بین بزانین کام لەم دووانە (واتە بەندەو عادل) شیاوبونیان دەسەلێنن بۆ جێگەداری.

بەندە لەکاتی بیستنی ئەو فەرمایشتەدا تەزوویەك هات بەلاشەمداو لەدڵی خۆمدا ووتم خودایە ئەوا لەئێستاوە پەیمان دەدەم بە تۆو بەڕۆحی پیرانی تەریقەت کە ئەوەی لەتوانامدا بێت وەپێویست بکات بۆ شیاوبوونی جێگەداری حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بیگرمەبەرو ئەنجامی بدەم وەئەو نائومێدیەی بگۆڕم بەئومێدو دڵخۆشی.

بۆ ڕۆژی سێهەمی ئیرشادەکە ئەو حەزرەتە تەشریفی برد بۆ گوندی خانەگاو شەوی دوایی بەخەڵکی ئەو گوندەی فەرموو لەبەرئەوەی کە زۆربەتان سەیدن هەربۆیە لەخزمەت مەحاسینی شەریفدا هاتووم بۆ ئیرشادی ئێوە تاوەکو هەمووتان بە پیرو گەنجەوە بتوانن زیارەتی بکەن (چونکە لەوسەردەمەدا زۆربەیان مەحەبەتێکی تایبەتیان بۆ پێغەمبەری خودا (صلی الله علیەوسلم) دەردەبڕی) ئەوکاتەش لە خانەقاو ماڵی سەید نەجیب (بەڕەحمەت بێت) لەلایەن جەنابی سەید شەهابی کوڕیەوە (خودا بیپارێزێت) دەعوەت کرابووین. ئەو حەزرەتە مەحاسینی شەریفی لەماڵی مەرحومی سەید عبدالرحمانی ئەشرافی دانابوو تاوەکو ئامادەکاری پێویست بکرێت بۆئەوەی لەخزمەتیداو بەمەراسیمێکی شایستە بەڕێ بکرێت بۆ خانەقای سەید نەجیب پاشان بەئامادەبوونی قەرەباڵغیەکی زۆر لە سادات و

بـۆ ڕۆژی چـوارەمی ئیرشـادەکە ئـەو حەزرەتـە تەشـریفی بـرد بـۆ شـاری کرماشـان و بۆماوەی شەوو ڕۆژێك لەخانەقای حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) مایەوە کە لەو سەردەمەدا لەلایەن مەرحومی سەید عبدالرحمان حوسەینیەوە کەخەلیفەی حەزرەتی شێخ ئەحمەد بوو (قدس سره) سەرپەرشتی دەکرا وەلەو خانەقایەدا موریدەکان دەهاتن بۆ زیارەتی و پاشان کۆتایی بەئیرشادەکەی هێناو لەخزمەتیدا گەڕاینەوە بۆ شاری سنە لەدوای ئەو سەفەرە بەچەند ڕۆژێك بەندە چوومە خزمەت حەزرەتی شێخ ئەحمەدو (قدس سره) عەرزم کرد قوربان بڕیارمداوە ئەگەر جەنابت ئیجازە بفەرمووی دەست بەخوێندنی قورئان و زانستە شەرعیەکان بکەم هەروەها مامۆستایەکم بۆ دیاری بکە کە لە خزمەتیدا ئەو وانانە بخوێنم.

شەوی هەینی موریدێکی زۆر لەخانەقادا کۆبوبونەوە بۆ ئەنجامدانی مەراسیمی خەتمەو زیکر پاش کۆتایی هاتنی ئەو مەراسیمانە مەلا زاهیدی نەسەناری کە زانایەکی ئاینی و خەلیفەی ئەو حەزرەتە بوو لەو کاتەدا ئامادەبوو، پێی فەرموو مەلا زاهید دەبێت کاتێك تەرخان بکەیت بۆئەوەی عەلی کوڕم لەخزمەتتدا زانستە شەرعیەکان بخوێنێت. ئەویش عەرزی کرد قوربان هەرچەندە من لە قوتابخانە وانەی ئاینی دەڵێمەوەو کارمەندی فەرمیم بەڵام فەرمانی جەنابت لەپێش هەموو شتێکە بۆ من هەربۆیە هەوڵی خۆم دەخەمە کارو شەوانە کاتێك دیاری دەکەم بۆ ئەوەی وانە شەرعیەکان بڵێمەوە بە شێخ عەلی کوڕتان.

مامۆستا مەلا زاهید شارەزاییەکی باشی هەبوو لە تەجویدو ئادابەکانی تەریقەتدا بەتایبەت لە شەرح کردنی کتێبی (سراج الطالبین)دا هەروەها بەباشی قوتابی تێدەگەیاند، وەلەپاش کۆتایی هاتنی دەرسی تەجوید هەندێك لەو ئادابانەشی کردبوو بە وانەی شەوانە بۆ بەندە. هەرچەندە پێش کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە لەگەڵ عادلدا لەخزمەت جەنابی مامۆستا مەلا ئەحمەدی گۆباندا (خودا بیپارێزێت) جوزئی عەمەی پیرۆزمان بەحونجەوە

خوێندبوو وەسوودێکی باشمان لەوماوەیەدا وەرگرتبوو بەڵام مامۆستا مەلا زاهید بەهۆی ئەو تەجویدەوە کە بەچاکی تێی دەگەیاندم توانی لەماوەیەکی زۆر کورتدا کە بریتی بوو لە (بیست و سێ) ڕۆژ قورئانم پێ خەتم بکات. ئەو شەوە کە مامۆستا مەلا زاهید ئەو مژدەیەی بەو حەزرەتە ڕاگەیاند بوەهۆی دڵخۆشی و شادمانی لەسیماو ڕوخساری پیرۆزیدا وەهەر لەوکاتەداو بەوبۆنەیەوە فەرمانیدا بەیەکێك لەموریدەکان تاوەکو شیرینی بکڕێت و بەناو موریدەکان و ئەهلی خانەقادا بڵاوی بکاتەوە، وەئیدی هەرکات میوان بهاتایەتە خزمەتی بەتایبەت زانا ئاینیەکان پێیانی ڕادەگەیاند کە ئەوە عەلی کوڕمەو سوپاس بۆ خودا لەوماوە کەمەدا قورئانی بەتەجویدەوە خەتم کردوەو ئێستاش زانستە شەرعیەکان دەخوێنێت.

پاش سێ مانگ لە خەتمی قورئانی پیرۆز خودای مەزن یارمەتیدام و توانیم کتێبە سەرەتاییەکانی زانستی صەرف و نەحو تەواوبکەم لەماوەی ئەو خوێندنەمدا موریدەکانی جوانڕۆو سابڵاغو سەردەشت و شارەکانی دیکەی ڕۆژهەڵات دەهاتنە خزمەت ئەو حەزرەتەو داوایان لێ دەکرد کە سەردانی ئیرشاد بکات بۆ ئەو ناوچانە بەڵام بەندە بەهۆی خوێندنەوە نەمتوانی لەو ئیرشادانەدا لەخزمەت ئەو حەزرەتەدا ئامادەبم، دواتر کە لە سەفەری سابڵاغو بۆکان گەڕایەوە باسی ئەو پێشوازیە پڕ لە مەحەبەت و حەماسیەی سابڵاغیان بۆ گێڕامەوە کە لەلایەن هاوڵاتیانی بەوەفاو ئاین پەروەری ئەو شارە خۆشەویستەوە لەبەرامبەر ئەو حەزرەتەدا ئەنجامدرا بوو بەجۆرێك کە پێشتر لەوشارەدا پێشوازی لەوشێوە لەهیچ کەس نەکرابوو.

حاجی سدیقی میری بۆی گێڕامەوەو ووتی بەهۆی قەرەباڵغی هاوڵاتیانی سابڵاغەوە نزیك بوو ئۆتۆمبیلەکەم بەرزبکەنەوە وەلەماوەی کاتژمێرێکدا توانیم تەنها یەك کیلۆمەتر

بــبڕم بــەهۆی زۆری خەڵکەکــەوە هــەروەها ئەوکاتــەی حــەزرەتی شــێخ ئەحمــەد (قــدس ســره) لەئۆتۆمبیلەکـەم هاتـە خـوارەوە ئـەو خەڵکـە دڵگـەرمو گیـان فیدایانـە دەورەیـان گـرت و خستیانە سەرشانیان وەعابا پیرۆزەکەیان لەبەریدا

پارچە پارچە کردو بەمەبەستی تەبـەڕوك پارچـەکانیان لـەنێوان خۆیانـدا دابـەش کـرد وەبەناچاریی چەند موریدێك چواردەوریان گـرت تـاوەکو بـەهۆی ئـەو قەرەباڵغیـەوە ئـازارو زیانی پیّ نەگات.

پاش هەفتەیەك لەگەڕانەوەی ئیرشادی سابڵاغ و بۆکان موریدەکانی ناوچـەی لـەیلاخ و بلّوان ئاوا هاتنە خزمەت ئەو حەزرەتەو عەرزیان کـرد قوربـان چـاوەڕێی تەشـریف هێنـانی جەنابتین بـۆ ئیرشـادی ناوچـەکەمان وەمـوریـدو مـەنسـوبەکان بـیّ سـەبرانە موشـتاقی ئـەو ئیرشادەن ئەو حەزرەتـەش لەوەڵامیانـدا فـەرمووی هەرچـەندە ماوەیـەکی کەمـە لەئیرشـادی ناوچـەکانی سـابڵاغ و بۆکـان و سەردەشـت گەڕاومـەتـەوەو زۆر مانـدووم بـەڵام لەبەرئـەوەی بەوشێوە بەدڵگەرمی و ئیخلاسەوە هاتون و بانگهێشتم دەکەن ئەوا دڵتـان ناشـکێنم و بـۆ چەند ڕۆژێکی دیکە دێم بۆ ئیرشادی موریدو مەنسوبی ئەو ناوچانە.

پاش ئەوەی ئـەو شـاندە گفتوگۆکانیـان تـەواوبوو وەپـەیمانی ئیرشـادیان لـەو حەزرەتـە وەرگرت و لە خزمەتی مورەخەس بوون هەندێك لە خەلیفەو موریدەکانی کە لەوکاتـەدا لـە خانەقای سنە ئامادەبوون عەرزیان کرد قوربان دوو داواکاریمان هەیـە لەخزمـەت جەنابتـدا هیـوادارین لێمـان قـەبوڵ بفـەرمویت یەکـەم جـەنابت بـەم شـێوەیە کـە دڵـی هـیچ کـەس لەموریدەکان نارەنجێنیت و هەمیشە ئامادەیت بچیت بەدەم داواکانیانەوە باش نیـە چـونکە زۆر ماندوو دەبیت و ئێمەش ترسمان لە زیادبوونی ئازارو نەخۆشیەکەت هەیەو پێمان خـۆش نیە کە تەندروستیت بکەوێتە مەترسیەوە.

وەداواکاریەکەی دیکەشمان ئەوەیە لەوکاتەوەی کە جەنابت تەشریفت هێنـاوە بـۆ سـنەو خانەقات دامەزراندوە سەرنجمان داوە نان وخواردنی ماڵ و منداڵت لەگەڵ ئەهلی خانـەقادا یەك جۆرەو هیچ جیاوازیەکیان نیە وەئەم شێوازە لـەناو خانـەقاکان و مەشـایخەکانی ئێـرەدا نامۆیـەو نـەبووە بـە بـاو هەربۆیـە داوات لێ دەکـەین کـە موریـدەکان و ئـەهلی خانـەقا خواردنێکی سادەو جیاواز لەخواردنی ماڵەوەیان بۆ ئامادە بکرێت.

حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەوەڵامیانـدا فـەرمووی هـۆی بەدەمـەوە چـوونم بـۆ داواکاری موریدەکان ئەوەیە کە لەخودی حەزرەتی حسامەدینم (قدس سره) بیست دەیفەرموو (موریدەکانم لە ئەولادەکانم عەزیزترن بەلامەوە وەڕاگرتنی دڵیان ئەرکە لەئەستۆی هـەموو ئەولادەکانمدا وەئەو ئەولادەی کە دەیەوێت لەڕێبازەکەمدا قەبوڵ بکرێت بـادڵی موریـدەکانم نەڕەنجێنێت). جالەبەرئەوە پەیمانێکەو داومە بەخودای خۆم و ڕۆحی موبارەکی ئـەو حەزرەتـە کـەوا تالـەم جیهانـەدا بـژیم و تائەوەنـدەی کـە لەتوانامـدا بێـت دڵـی هـیچ موریـدێکی ڕاستەقینەی ئەو حەزرەتە نەڕەنجێنم و بڕۆم بەدەم داواکانیانەوە.

لەبارەی داواکاری دووهەمی ئەو خەلیفەو موریدانەیشەوە فەرمووی ئەو موریدانەی کە حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) بەوئەندازەیە خۆشی ویستبن و پشتیوانیان بێـت وەلەدڵیـدا عەزیزتربن لەئەولادەکانی ئیتر من چۆن بتوانم لە خزمەت کردنیاندا کەمتەرخەم بم سـوێند بەخوا ئەگەر نەتوانم نانو خوانی باشتر لەوەی خۆم و ماڵو منداڵمیان بـۆ ئامادەبکـەم ئـەوە دڵنیابن هیچ کات خوانی سادەو کەمتریان پێشکەش ناکەم.

بـۆ هەفتـەی پـاش ئـەو چـاو پێکەوتنـە حـەزرەتی شـێخ ئەحمـەد (قدس سره) ئیرشـادی ناوچـەکانی لـەیلاخ و بڵـوان ئـاوای دەسـت پێکـردو بۆمـاوەی دوو ڕۆژ لـەناو موریـدو مەنسوبەکاندا سەردان و ئیرشادی ئەنجامدا. پاش ماوەیەك لەئیرشادی ئەو حەزرەتە بۆ شـارو

شارۆچکەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و بڵاوبونەوەی دەنگوباسی ئەو هەموو پێشوازیە پڕ جۆش و خرۆش و حەماسەتەی هاووڵاتیانی ئەو ناوچانە، بەوهۆیەوە لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە گرنگی زیاتر دەردەبڕا بەرامبەر حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بەڕادەیەك کە خودی پارێزگارو قایمقام و هەندێك لەبەرپرسە باڵاکانی شاری سنە بۆ چەند جارێك هاتنە خزمەتی ئەو حەزرەتە هەروەها کۆمەڵێك یارمەتیان بەخانەقا پێشکەش کرد بەناوی (هاوکاری کردن بە مورشیدێکی ئاوارە) کە بریتی بوو لە ئازوقەیەکی مانگانە، دواتر بەئێمەیان ڕاگەیاند ئەو یارمەتیانە لەلایەن نەتەوە یەگرتوەکانەوە دەنێردران بۆ ئاوارەکانی عێراق وەئەو بەشەشیان تەرخان کردبوو بۆ ئەوحەزرەتەو خانەقاکەی بەڵام ماوەیەك لەپاش کۆچی دوایی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) هەموو ئەو هاوکاریانەیان بڕی.

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی گەشەسەندنی ڕێبازی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) بەهۆی ئەو ئیرشادانەوە، پیلان گێڕە بێ باوەڕو ناحەزەکانی دژ بەو حەزرەتە (ئەو تاقمەی کەلە سەرەتای کتێبەکەدا ئاماژەمان بەهەندێکیان کرد) هەستیان کرد بەکاریگەری و خۆشەویستی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەناو دڵی هاووڵاتیاندا وەدەترسان بەلەناوچوونی بەرژەوەندی و پێگەی خۆیان لەوناوچانەدا هەربۆیە نەیانتوانی ڕق و کینەی ناو ناخیان کۆنترۆڵ بکەن و بەپەلە دەستیان کردەوە بەپیلان گێڕی دژ بەو حەزرەتە کە یەکەم پیلانیان هەوڵدان بوو بۆ دزین و بەزۆر داگیر کردنی مەحاسینی شەریف هەرچەندە لەوکارەدا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا بەڵام تائەندازەیەك لەئاواتی خراپی خۆیان نزیك بوونەوە کە ئەویش ئازاردانی زیاترو بەردەوامی دڵ و دەروونی ئەو حەزرەتە بوو.

هەروەها لەوسەردەمەدا دەوڵەتی ئێران هەر چوار ساڵ جارێك هەموو بەرپرسە فەرمیەکانی پارێزگاکانی ئێرانی ئاڵوگۆڕ دەکرد یاخود لەسەر کارەکانیان لایدەبردن،

وەلـەناو ئـەو بەرپرسـانەدا ئاغـای هـەراتی و یـەك دوو بەرپرسـی دیكـەی پارێزگـای سـنە لەسەركار لابران كە مەحەبـەتێكی زۆری ئـەو حەزرەتـەیان هـەبوو هەربۆیـە بـەلابردنی ئـەو بەرپرسانە هەلی زیاترو گونجاوتر بۆ بێ باوەڕانی پیلانگێڕ ڕەخساو توانیـان گشـتگیرانە تـر بچنەوە بەگژ حەزرەتی شێخ ئەحمەدو (قدس سره) پەیڕەوانیـدا وەهـەروەها فشـارەكانیان زیـاتر دەكرد بۆ دزین و دەست بەسەردا گرتنی مەحاسینی شەریف.

## (بڕیاری دیاری کردنی جێگەدار لەلایەن حەزرەتی شێخ ئەحمەدەوە (قدس سره))

سەرەتای وەرزی پایز بوو کە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) نیشانەکانی نەخۆشی لەجەستەیدا ئاشکرا بوو وەیەکێك لەونیشانانە (گەرمبوونی ئەندامەکانی لاشەی و بێ حەواسی بوو) دوای تێپەڕ بوونی دوو بۆ سێ ڕۆژ هەستمان بەزیادبوونی نەخۆشیەکەی کرد هەندێك لە موریدەکان پزیشکێکی بەناوبانگی شاری سنەیان هێنا بۆ خزمەتی تاوەکو چارەسەری ئەو نەخۆشیەی بکات بەوهۆیەوە کۆمەڵێك دەواو دەرمانی بۆ نووسی بۆماوەی دوو هەفتە تەندروستی بۆ گەڕایەوە بەڵام ئەو حەزرەتە هەستی بەوە کردبوو کە ئەو نەخۆشیەی چارەسەری نیەو کۆتایی ژیانی نزیك بووەتەوە وەئەو نەخۆشیەی نیشانەی لەدونیا دەرچونیەتی هەربۆیە لەوماوەدا کە موریدو مەنسوبەکانی دەهاتنە خزمەتی هەندێك باسی لەبارەی ئادابی تەریقەت و هەوڵ و کۆششەکانی خۆی لەناو ڕێبازی پیرۆزی حەزرەتی حسامەدیندا (قدس سره) بۆ دەکردن و چەند ئامۆژگاریەکی لەوبارەوە دەکردن پاشان ئەم بەسەرهاتەی بۆ دەگێڕانەوە کەوا (ڕۆژێکیان پاش نیوەڕۆ بوو لەحەوشەی ماڵەکەمدا دانیشتبووم عەلی کوڕم کە ئەوکاتە تەمەنی پێنج ساڵان بوو لەباوەشمدا دانیشتبوو، دوای ماوەیەك هەستم بەبۆنێکی زۆرخۆش کرد کە لەتەمەنمدا هەستم بەبۆنی ئاوەها خۆش نەکردبوو یەکسەر عەلی بەدەنگی بەرز ووتی بابە ئەوە بۆنی (بابە عەلیە)[٣٣] لەوکاتەوە ئومێدم پەیداکرد بەوەی کە ڕۆحی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) مەیل و لوتفی لەگەڵ عەلی کوڕمدا هەیەو دەگاتە پلەیەکی بەرزی مەعنەوی).

[٣٣] واتە حەزرەتی حسامەدین (قدس سره)، بەندە ئەو بەسەرهاتەم وەکو خەون دێتەوە یاد ...................... نووسەر.

ئێستا شوکر بۆ خودا عەلی شیاوی جێگەداری منەو هەروەها شارەزاییەکی باشی لەزانستە شەرعیەکاندا پەیداکردوە وەلەئەنجامدانی ئادابی تەریقەتدا پێشکەوتنی بەرچاوی بەدەستهێناوە لەبەرئەو هۆکارانە من عەلی بەجێگەداری خۆم دەستنیشان دەکەم بائێوەش شاهیدی ئەم ووتانەی من بن. ئەو حەزرەتە لەکاتێکدا ئەم فەرمایشتانەی دەکرد کە تەنها موریدەکان لەخزمەتیدا بوونایە بەڵام ئەو کاتانەی میوانی دیکە بهاتایە بۆ خزمەتی بەهیچ شێوەیەك لەم بارەیەوە نەدەدوا (دواتر ئاماژە دەکەین بە هۆکاری تایبەت کردنی ئەو بابەتانە بەموریدەکانیەوە).

لەو سەردەمەدا بەندە سەرەڕای زانستە شەرعیەکان کە لەخزمەت مامۆستا مەلا عەلیدا دەمخوێند (لەبەرئەوەی مامۆستا مەلا زاهید دەوامی فەرمی زۆر بوبو بۆی نەدەکرا کە بەردەوام بێت لەسەر ووتنەوەی وانەکان بەبەندە هەربۆیە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) ئەو مامۆستایەی بۆ دیاری کردبوم) مامۆستایەکی دیکەش بۆ فێربوونی زمانی فارسی بۆ بەندە دیاری کرابوو بەناوی حاجی کاکە شێخی حسامی (بەڕەحمەت بێت) کەیەکێك بوو لەخەلیفەکانی ئەو حەزرەتە وەئەو کتێبانەشی کە لەخزمەتیدا بۆئەو مەبەستە دەمخوێند کتێبی (گولستان)ی سەعدی شیرازی و (نصیحة الملوك)ی ئیمام محمد غەزالی بوو (خودا لێیان ڕازی بێت).

جارێکیان کۆمەڵێك لە خەلیفەو موریدەکانی سنەو بۆڕیدەر لە خزمەت ئەو حەزرەتەدا دانیشتبوون هەروەها بەندەش لەوکاتەدا ئامادەبووم کە ئەو ڕیوایەتەی پێشتر باسمان لێوەکرد بۆئەو کۆمەڵەی دەگێڕایەوە ئەو باسە لەناو دڵی ئامادەبواندا ئەوەندە کاریگەر بوو کە بەتێکڕا هەموو دڵگەرم بوون و تەنانەت فرمێسك بەچاوی موبارەکی حەزرەتی شێخ ئەحمەدیشدا (قدس سره) هاتەخوارەوە، لەپاش کۆتایی هاتنی گێڕانەوەکە ئەو

حەزرەتە تەشریفی برد بۆ ژوورەکەی خۆی دواتر هەندێك لەخەلیفەکان داوای ڕوخسەتیان لەجەنابی کرد تاوەکو بچنە خزمەتی، بەندە ئەوکات بێ ئاگابووم لەمەبەستی کۆبونەوەی ئەو خەلیفانە لەگەڵ ئەو حەزرەتەدا تائەو کاتەی کۆچی دوایی کردو چەند مانگێك تێپەڕی بەسەر ئەو کارەساتەدا، ئەوکات حاجی عبداللەی باوەڕێزی بۆی گێڕامەوەو ووتی کاتێك کە لەگەڵ خەلیفەکانی دیکەدا چووینە خزمەت ئەو حەزرەتە عەرزمان کرد قوربان لەبەرئەوەی ناحەزان و بێ باوەڕان لەدوای خۆت کێشە دروست نەکەن بۆ شێخ عەلی کوڕت و بەتایبەت لەکاتی مەراسیمی جێگەداریەکەیدا بۆیە داوات لێ دەکەین کە لە حاڵی حەیاتی خۆتداو بەدەستی موبارەکی خۆت مێزەرەو عابای جێگەداری و ئیرشاد بکەیتە بەری هەروەها موریدو مەنسوب و خەڵکانی دیکە بانگهێشت دەکەین بۆئەو مەراسیمە تاوەکو ئەو بێباوەڕانە هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەبێت کە لەدژمان بەکاری بهێنن.

لەوەڵامدا فەرمووی عەلی تەمەنی لەسەرەتای لاوێتیدایە وەئاگاداری ئەوەشم کە لەئێستادا ناحەزان و بێ باوەڕانی ڕێبازی ڕاست و پیرۆزی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) هەموو هێزو توانایەکی خۆیان لەدژایەتی مندا بەکاردەهێنن لەبەرئەوە ئەگەر لەم کاتەدا ئەوکارە بکەم لەوانەیە لەناوی ببەن هەربۆیە مەراسیمی بەستنەوەی مێزەرەی ئیرشادو جێگەداریەکەی ئەمانەتێکەو لە ئەستۆی موریدەکانمدایە وەدەبێت پاش وەفاتم جێبەجێی بکەن.

پاش هەفتەیەك لەوگفتوگۆیانە نەخۆشیەکەی ئەو حەزرەتە دووبارە سەری هەڵدایەوە بەڵام ئەم جارەیان ئازارو بێ حەواسیەکەی بەتوندی و زوزو ڕووی تێدەکرد، خەلیفەو موریدەکان پێشنیاریان کرد کە ئەو حەزرەتە تەشریف ببات بۆ نەخۆشخانەی (پارس) لەتاران بەهۆی بوونی پزیشك و چارەسەری باشتر لەو نەخۆشخانەیەدا، لەماوەی یەك

مانگدا سێ سەفەری تارانی ئەنجامدا وەئەو ماوەیەی کە لە سنەدا دەمایەوە دەیفەرموو پاش نوێژی عەسر سورەتی (یاسین)م بەسەردا بخوێنن بەندەش هەڵدەستام بەوکارەو هەموو جارێك کە دەستم دەکرد بەخوێندنی ئەو سورەتە پیرۆزە ئەو حەزرەتە دەستی بەرز دەکردەوەو دەیفەرموو ((خودایە من ناتوانم شوکرانەی تۆ بکەم بەرامبەر بە هەموو ئەو ئاواتانەی بۆ منت بەدی هێناوە کە گرنگترینیان ئەوەبوو لەکاتی نەخۆشی سەرەمەرگمدا یەکێك لەئەولادەکانم (یاسین)م بخوێنێت)) لەگەڵ ئەم فەرمایشتانەی دەکرد فرمێسك بەچاوی موبارەکیدا دەهاتە خوارەوە.

جاری دووهەم کە لەتاران گەڕایەوە بۆ سنە زۆر بێ هێزو لاواز بوبو وەدەبوایە پاش هەفتەیەکی دیکە تەشریف بباتەوە بۆ نەخۆشخانە، دوو ڕۆژ پێش ئەو سەفەرەی تەلەفونی کرد بۆ شێخ حەیدەری حسامی (کە خەلیفەی ئەو حەزرەتەیەو لەزمانی فارسیدا شارەزاییەکی زۆری هەیە) تاوەکو بێت بۆ خزمەتی بۆ ڕۆژی دوایی شێخ حەیدەر هاتە خزمەتی و ئەو حەزرەتەش پێی فەرموو (من سبەی دەبێت بگەڕێمەوە بۆ تاران هەرچەندە زۆربەی موریدەکان شاهیدی ئەوەن کە من (عەلی)م لەجێگەی خۆم داناوە بەڵام بۆئەوەی دوارۆژ لەحزوری خوداو پێغەمبەرو (صلی الله علیەوسلم) ئەولیاکاندا بەڵگەی تەواوەتیم بەدەستەوە بێت کەوا ئەو کەسەی شیاوی جێگەداری من و پیرانی تەریقەت بوو کە عەلی کوڕمە لەپاش خۆم دیاریم کردوەو ئەو جێگەیەم بەبەتاڵ بەجێ نەهێشتوەو ئەمانەت پارێز بووم، هەربۆیە داوات لێ دەکەم لەوبارەیەوە وەسیەت نامەیەك ئامادەبکەیت ئەگەر خودای تعالی مۆڵەتی دامو بەزیندووی گەڕامەوە بۆ ئێرە ئەوا واژووی دەکەم ئەگەرنا ئەوا تۆو خەلیفەکانی دیکە ئەوانەی کە شاهیدی ئەم وەسیەتەی من بوون واژووی بکەن). بەڵام ویستی خودای مەزن ئەوەبوو کە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەوسەفەرەی نەگەڕێتەوەو کۆچی دوایی بکات.

## نامەی ژمارە: (٣)

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله الذی شرع الأحکام فبین الحلال والحرام وأمر بالصالحات ونهی عن الآثام وجعل الأولیاء والعرفاء سراج الدین وسفینة النجات وامناء الأمة اللهم فصل وسلم علی سیدنا محمد نبی الکریم صاحب الخلق العظیم والصراط المستقیم وعلی آله واصحابه واولیائه والتابعین لهم باحسان

پس سپاس و ستایش خدا را که بندگان خود را سعادت عنایت فرموده تا اشخاص شایسته و لایق و متقی را جهت خدمت به دین مبین اسلام و مسلمین برگمارند. حقیر گوشه‌گیر خادم الفقراء احمد حسامی نقشبندی که سالیان درازی خدای تبارک و تعالی به اینجانب فرموده عمر خود را در خدمت علمای اعلام و مسلمین خداجوی سپری نمایم و آنچه در توان و ظرفیت من بوده است بخدمتگزاری سالکان و معتکفان و خانقاه‌نشینان اهل طریقت در طبق اخلاص گذاشتم و اگر در دوران عمر من آنچه وظیفه یک خادم است کوتاهی بعمل آمده امیدوارم قلم عفو را بر کوتاهی خدمتم بکشند و در حق بنده از دعای خیر یاد فرمایند زیرا چه کسی بی کوتاهی دارد. اکنون بنا بر کهولت سن و موقعیت زمانی خود را موظف دانستم کسی را در این پست خادمیت و سرپرستی خانقاه قطب العارفین حضرت حسام الدین قدس سره و طریقه خواجگان نقشبندی برگزینم تا وظیفه انسانی و اسلامی و خدمتگزاری فقرا را بنحو احسن ادا نماید. آنچه که مطالعه نمودم حسن اخلاق و عمل صالح و آینه درخشان خادمیت را در وجود فرزند برومند و دلبندم محمد علی شایسته دریافتم که شایسته خدمتگزاری است. و ایشان را بجانشینی خود انتخاب و مشخص نمودم. امیدوارم او هم با نیتی راسخ و خلوص ارادت و کسب علم و دانش همراه با عمل صالح این بار سنگین امانت را بر دوش گرفته و کمر همت بخدمتگزاری مسلمین و منسوبین خاندان حضرت حسام الدین بسته و آداب و سنن طریقه رفیعه نقشبندیه قدس الله اسرارهم را کما فی السابق با جان و دل بجای آورده و طالبان و تشنگان طریقت را ارشاد و هدایت نماید. خداوند ایشان را موفق بدارد. همت پیران طریقت و پیران نقشبند توحید یار و مددکارش باد. و در ضمن به برادران و عزیزان و محبان این خاندان عرض می‌نمایم کسی که محبت ما را در دل دارد از این پس همان لطف و محبت را بفرزندم محمد علی مبذول فرمایند. بقیه برادران و فرزندان عزیزم که یکایک آنها را از ته قلب دوست داشته و دارم و از دعای خیرشان غافل نبوده و نیستم مطمئنم که محبت محمد علی را در دل پرورانده و از او حمایت کنند. خدای تبارک و تعالی از ایشان راضی باد انشاءالله. در خاتمه از پروردگار عالم و خلاق بنی آدم تمنا میرود همه مسلمین را براه راست هدایت و از رحمت بیکران خود برخوردارشان فرماید و از شفاعت حضرت ختمی مرتبت صلی الله علیه و آله محرومشان ننماید آمین یا رب العالمین

دعاگوی خیرتان احمد حسامی النقشبندی

بتاریخ ۲۴ شهریور ماه سال ۱۳۶۸ شمسی برابر با ۱۴ صفر المظفر ۱۴۱۰ هجری قمری

شهد انه جناب حضرت آیت الله به بنده امر فرمودند که این نامه را از طرف آنحضرت بنویسم و بعداً بخدمتشان تقدیم دارم ولی [illegible] چون از نوشتن این سفارش‌نامه حضرت فقید به تهران منتقل [illegible]

[illegible] ٦٨/٧/١٧

شهدت انه از زبان خود آنحضرت استماع نمودم که فرزندش جناب شیخ محمد علی را بجانشینی خود تعیین فرمود الحقیر ملا شیخ محمد [illegible]

حقیر گوشه‌گیر [illegible] شیخ احمد نقشبندی [illegible]

[illegible]

## (تەواوکەری نامەی ژمارە: (٣))



باسمه تعالی

فقیر از حضرت شیخ احمد سؤال کردم کدام یک از شیخ زادگان جانشین حضرت شیخ اند

فرمودند علی از طرف خدا تعیین شده و علی جانشین است - [illegible] شیخ محمد [illegible]

فقیر شهد الله از حضرت شیخ احمد شنیدم [illegible] فرزند علی چون [illegible] نسبت دارد

جانشین من است [illegible] به فقیر [illegible] حضرت حسام الدین مدد کار او است

ان شاء الله باعث دلگرمی مسلمانان می [illegible] سید زاهد [illegible]

## (دەقی فارسی وەسیەت نامەکەی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره))

**تێبینی: حەزرەتی شێخ ئەحمەد بێجگەلەم وەسیەت نامەیە چەند وەسیەت نامەیەکی دیکەی بۆ پەیڕەوان و بنەماڵەکەی نووسیوە لەبەر تایبەت بوونی ئەو وەسیەت نامانە بە بنەماڵەو پەیڕەوانیەوە لێرەدا نەمان نووسیون ................ نووسەر.**

**دەقی کوردی وەسیەت نامەی ژمارە (٣):**

**(بسم الله الرحمن الرحیم)**

**سوپاس بۆ ئەو خودایەی کەوا یاساکانی داناو بەوهۆیەوە حەڵاڵ و حەرامی ڕوون کردەوەو فەرمانی بەکارە چاکەکان کردو تاوانەکانی قەدەغەکرد وەپیاوچاکان و عاریفەکانی کرد بەچرای ئاین و کەشتی ڕزگاری و ئەمانەت پارێزی ئومەت، بەوهۆیەوە خودایە داوات لێ دەکەم کە ڕەحمەت و سڵاو بنێریت بۆ ڕۆحی گەورەمان محمد ئەو پێغەمبەرە بەرێزەی کە خاوەنی خوڕەوشتی بەرزو ڕێگای ڕاستە هەروەها بۆ ڕۆحی ئالوبەیت و ئەسحابەکانی وەدۆست و شوێنکەوتوەکانی بەگشتی و بەباشترین شێوە.**

**سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە گرنگی بەخشی بە بەندەکانی وەبەوکارەی خۆشبەختی کردن تاوەکو لەنێوانیاندا کەسانێکی شیاوو بەتەقوا هەڵبژێرێت بۆ خزمەت کردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و موسوڵمانان. بەندەی گۆشەگیر (خادم الفقراء) ئەحمەدی حسامی نەقشبەندی کە بۆ ماوەی چەند ساڵێکی زۆر خودای تعالی هیدایەتی دام تاوەکو ژیانی خۆم بۆ خزمەت بەزانا پایە بەرزەکان و موسوڵمانە خودا پەرەستەکان تەرخان بکەم وەئەوەی لەتوانامدا بوو بۆ خزمەت کردنی کەسانی سالك و ئەهلی ئیعتیکاف و خانەقاو ئەهلی تەریقەت بەئیخلاسەوە ئەنجامدا وەئەگەر لەوماوەیەی ژیانمدا لە ئەنجامدانی ئەرکی خادمیمدا کەموکورتیەك بەدی کرابێت هیوادارم قەڵەمی عەفوو لێبوردن بکێشن بەسەر ئەو کەم تەرخەمیەی کە لەخزمەتەکانمدا هەبووە وەلەبەرامبەریدا لە دۆعای خەیر فەرامۆشم مەکەن لەبەرئەوەی (هیچی لەدەست نایەت بێنەوا بێجگە لەم خزمەتە کەمەی) ئێستاش بەهۆی بەساڵا چوون و تایبەت بوونی ئەم سەردەمەوە بەئەرکی خۆمم زانی کەوا کەسێك دەستنیشان بکەم بۆ شوێن و جێگای خزمەتکاری و سەرپەرشتی خانەقای (قطب العارفین)**

**حەزرەتی حسامەدین و (قدس سره) ڕێبازی خواجەگانی نەقشبەندی تاوەکو بەباشترین شێوە ئەرکی مرۆیی و ئیسلامی و خزمەتکاری هەژاران جێبەجێ بکات.**

**لە لێکۆڵینەوەکانمدا بۆم ئاشکرابوو کە کوڕی ئازیزم (محمد علی) خاوەنی خوڕەوشتی بەرزو چاکەکاریە وەداهاتوویەکی درەوشاوەی هەیە لەو خزمەتەدا، لەبەرئەو هۆکارانە ئەوم هەڵبژاردو دیاریم کرد بە جێگەداری خۆم هیوادارم ئەویش بە نیەتێکی بەهێزو ئیخلاس و ئیرادەت و بەدەستهێنانی زانست لەگەڵ کرداری چاکەدا ئەم ئەرکە قورسە بەئەمانەت پارێزیەوە بگرێتە ئەستۆو هیمەتی خۆی بخاتە کار بۆ خزمەت گوزاری موسوڵمانان و مەنسوبەکانی ڕێبازی حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) هەروەها ئاداب و بەرنامەکانی تەریقەتی نەقشبەندی و قادری بەگیان و بەدڵ وەکو ڕابردوو جێبەجێ بکات وەئیرشادو ڕێنوێنی پەیڕەوان و ئارەزومەندانی تەریقەت بکات، خودای تعالی موەفەقی بکات وەهیمەتی پیرانی تەریقەت و شێرانی بێشەی یەکتا پەرەستی لەگەڵیدابن و بچن بەهانایەوە. هەروەها بەبرایان و دۆست و ئازیزەکانم ئەو کەسانەی کە شوێنکەوتوی ئەم ڕێبازە پیرۆزەن ڕادەگەیەنم هەرکەسێك خۆشەویستی ئێمەی لەدڵدایە لەم کاتە بەدواوە ئەو لوتف و مەحەبەتەی کە بەرامبەر بە من دەریان بڕیوە بەهەمان شێوەش بن لەگەڵ (محمد عەلی) کوڕمدا.**

**هەروەها بە براو کوڕە ئازیزەکانی دیکەم کە هەریەکێکیانم لەناخی دڵەوە خۆش ویستوە بە ئێستاشەوە وەهیچ کات لەدۆعای خێر بێ بەشم نەکردون ڕادەگەیەنم کەوا ئەرکی سەرشانیانە خۆشەویستی (محمد عەلی) لەدڵی خۆیاندا پەرەپێبدەن و پشتیوانی لێ بکەن، خودای تعالی لێیان ڕازی بێت انشاالله.**

لەکۆتایدا لە پەروەردگاری جیهان و دروستکەری ئادەمیزاد دەپاڕێمەوە کەوا هەموو موسوڵمانان هیدایەت بدات لەسەر ڕێگای ڕاست وەلەڕەحمەتی فراوانی خۆی بەشدارمان بکات و لە شەفاعەتی حەزرەتی محمد (صلی الله علیەوسلم) بێ بەشمان نەکات، آمین یارب العالمین.

دۆعا گۆی خەیرتان

أحمد الحسامي النقشبندي

بەرواری: ٢٤ی شەهریوەری ١٣٦٨ی کۆچی|هەتاوی

بەرامبەر بە: ١٦ی سەفەری ١٤١٠ی کۆچی|قەمەری

❊ ❊

(خودا شاهیدە مەرحومی شێخ فەرمانی بە بەندە کرد کە ئەم نامەیەی سەرەوە بە نوێنەرایەتی ئەو حەزرەتە بنووسم پاشان بیبەمەوە خزمەتی بەڵام بەداخەوە لەپاش نووسینی ئەم نامەیە ئەو حەزرەتە کۆچی دوایی کردو ڕۆحی پاکی لەدونیا دەرچوو).

حەیدەری حسامی

بەرواری ١٧|٧|١٣٦٨ی کۆچی هەتاوی

❊ ❊

(خودا شاهیدە لە زمانی خودی ئەو حەزرەتەوە بیستم کە شێخ محمد عەلی کوڕی بە جێنشینی خۆی دەستنیشان کرد )

حاجی شێخ محمدی حسامی[٣٤]

---

[٣٤] کوڕی مەرحومی شێخ قادری سیویە کە هەردووکیان خەلیفەی حەزرەتی حسامەدین (قدس سرە) بوون ............ نووسەر.

(بەندەی گۆشەگیر شایەتی دەدەم کەوا حاجی شێخ ئەحمەدی حسامی نەقشبەندی فەرمووی هەرکات کۆچی دوایم کرد عەلی کوڕم جێگەدارمە)

حوسەینی

❊ ❊

(فەرموودەکانی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامیم بیست کەوا شێخ محمد عەلی بە جێگەداری خۆی دەست نیشان کرد)

سەید ساحیب حسامی

❊ ❊

(بەناوی خودای مەزن)

(بەندەی بێ نەوا پرسیارم لە حەزرەتی شێخ ئەحمەد کرد لە کوڕە شێخەکان کامیان جێگەداری حەزرەتی شێخن فەرمووی عەلی لەلایەن خوداوە دەست نیشان کراوەو عەلی جێگەدارە)

کاك شێخ محمد حسامی

❊ ❊

(خودا شاهیدە کە بەندەی بێ نەوا لە حەزرەتی شێخ ئەحمەدم بیست فەرمووی لەبەرئەوەی عەلی کوڕم زۆر ساڵحە ئەو جێگەداری منە هەروەها ئەمەشی بەبەندە ڕاگەیاند کە حەزرەتی حسامەدین (قدس سره) هەمیشە دێت بەهانایەوەو انشاالله دەبێتە هۆی دڵگەرمی موسوڵمانان)

حاجی سەید زاهیدی حسامی

❊ ❊ ❊

وێنەی ژمارە: (١٦)



(ئەم وێنەیە لەسەرەتای سەرهەڵدانی نەخۆشیەکەی حەزرەتی شێخ ئەحمەددا (قدس سره) گیراوە)

لەلای ڕاستەوە:

١ـ نووسەر ٢ـ حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) ٣ـ شێخ عادلی کوڕی ئەو حەزرەتە.

## ( مێژووی کۆچی دوای حەزرەتی شێخ ئەحمەدو (قدس سره) گەڕانەوەو ئەسپەردەکردنی تەرمی پیرۆزی )

هەمیشە لەسەفەرەکانی حەزرەتی شێخ ئەحمەددا (قدس سره) حاجی سدیقی میری لە خزمەتیدا بوو وەبەوجۆرەی پێشتر باسمان کرد شۆفێری تایبەتی ئەو حەزرەتە بوو، هەروەها لەو سەفەرانەی کە بۆ چارەسەر تەشریفی دەبرد بۆ تاران حاجی سدیق و شێخ جەمیلی برای و شێخ عیرفانی کوڕی لە خزمەتیدا بوون بەڵام لەکۆتا سەفەریدا بۆ ئەو شارە بەحاجی سدیقی فەرمووبو دەزانم ماوەیەکە لەکارو کاسبی دابڕاوی بەهۆی ئەم نەخۆشیانمەوە هەربۆیە لەپاش گەیشتنمان بە نەخۆشخانە دەبێت تۆ بگەڕێیتەوەو کارەکانت جەموجۆر بکەیت وەدواتر کە وادەی گەڕانەوەم بۆ سنە دیاری کرا خۆم تەلەفونت بۆ دەکەم بۆ ئەوەی بێیتەوە بۆ تاران. لەوماوەیەدا هەموو موریدو مەنسوبەکان و ماڵ و منداڵی چاوەڕوانی ئەوەبوون کە ئەو حەزرەتە بە تەندروستیەکی باشەوە تەشریف بهێنێتەوە وەبۆ بەدیهاتنی ئەو ئاواتەیان هەمیشە دەست بەدۆعاو خەیرو سەدەقە بوون.

شەوی پێنج شەمە (٥|١٠|١٩٨٩)ی زاینی بەرامبەر بە (٣|٤|١٤١٠)ی کۆچی بوو بەندە لە هۆڵی تەنیشت خانەقادا خەوتبووم پاش نوێژی بەیانی لەگەڵ ڕووناک بوونی ئاسماندا دەنگی زەنگی تەلەفون کەوتە بەر گوێمان حەرەمی ئەو حەزرەتە وەڵامی دایەوە حاجی سدیق بوو پێی ووت کەوا حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) ئیمشەو بەتەلەفون فەرموویەتی (سبەی دەگەڕێمەوە پێم خۆشە منداڵەکان بێنە دەرەوەی شار بۆ پێشوازیم لەبەرئەوەی زۆر بیریان دەکەم و دەمەوێت لەزوترین کاتدا چاوم پێیان بکەوێت). ئێستا ئەو حەزرەتە بەڕێ کەوتوە لە تارانەوە بەرەو سنە وەتا نیو کاتژمێری دیکە دێم بۆ خانەقا تاوەکو بڕۆین بۆ پێشوازی ئەو حەزرەتە.

هەموو ئەهلی خانەقا سەریان سوڕما لەو ووتانە بەهۆی ئەوەی هەمیشە حاجی سدیق لەخزمەتیدا بوو وەپێشتر وابڕیار بوو کە حاجی سدیق بڕوات بۆ تاران و بەئۆتۆمبیلەکەی خۆی بگەڕێنەوە ئێستا چ هۆکارێك ئەو بڕیارەی گۆڕی بۆیە ناڕوون بوو بۆمان تائەو کاتەی حاجی سدیق گەیشتە خانەقاو هاتە ژورەوەو ووتی هەموو ئامادەبن بابەڕێ کەوین بەڵام لەوکاتەدا خەمو خەفەت هەموو جەستەی داگرتبوو کاتێك ویستمان لەخانەقا دەرچین حاجی سدیق لەحەوشەکەدا بوو زۆری پێ نەچوو دەستی کرد بەگریان و هاواری کرد ووتی ئیمشەو حەزرەتی شێخ ئەحمەد کۆچی دوایی کرد لەگەڵ بیستنی ئەو هەواڵە دڵتەزێنەدا وامزانی دونیا ڕوخاوە بەسەرمدا وەهەموو ئەهلی خانەقا کەوتنە ناو غەمو گریان و نائارامیەوە وەبەندە وەك بەردێکی بێ گیان لە شوێنی خۆمدا بێ جوڵە مامەوە، خەفەتی لە دەستدانی ئەو مورشیدە مەزنە ئەوەندە قورس بوو کە بەتەواوی جەستەمی گرتبووەوە وەتائەو کاتەی نەگەیشتمە خزمەت تەرمی پیرۆزی ئەو حەزرەتە هەستەکانم لەدەست دابوون و فرمێسك بەچاومدا نەدەهاتە خوارەوە.

تاوەکو نیوەڕۆ هەواڵی وەفاتی بەناو هەموو موریدو مەنسوب و خزمەکانیدا بڵاوبوویەوە پاش نیوەڕۆ هەموویان لەخانەقادا کۆبونەوەو بڕیاریاندا کە بۆ پێشوازی تەرمی پیرۆزی بەڕێکەوین تاوەکو دەگەینە دەروازەی شاری قوروەو دێگولان، بۆ دەمەو ئێوارە گەیشتینە ئەو شوێنەی کە بۆ چاوەڕوانی دیاری کرابوو وەبۆ دەمەو عیشا تەرمی پیرۆزی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەناو ئەمبولانسێکدا گەیشتە لامان پاش ماوەیەك لەزیارەت و گریان و فوغانی موریدو کەسوکار، لە خزمەتیدا بەڕێ کەوتین بەرەو شاری سنە لەڕاستیدا ئەو شەوە موریدو مەنسوبەکانی ئەو حەزرەتە مەحەبەت و گیان فیدایی خۆیان بۆ ئەو حەزرەتەو ڕێبازەکەی سەلماندو زیاد لە هەزار کەس لە دەوروبەری خانەقاکەیدا

بەگریان و هاوارەوە تاسەر لەبەیانی بەپێوە ڕاوەستابون. بەگەیشتنی تەرمی پیرۆزی ئەو حەزرەتە بە کۆڵانی خانەقا بەهۆی قەرەباڵغی و هاوارو شیوەنی موریدو مەنسوبەکان دەتووت مەحشەر هەستاوە، ئەو شەوە تەرمەکەیان لەمزگەوتی (نەبی)دا دانا کە لەتەنیشت گۆڕستانی شێخ حەمە باقرەوە بوو وەبۆ ڕۆژی دوایی غوسڵ و کفنیان کرد.

بەموریدو مەنسوبی سنە ڕاگەیەنرا کە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) وەسیەتی کردوە تەرمی پیرۆزی لەگوندی گۆشخانی سەر بەناوچەی کەلاتەرزان کە مەرقەدی شێخ مەزهەری برای حەزرەتی حسامەدینی (قدس سرهما) لێ بوو بەموەقەت بنێژرێت تائەوکاتەی باشوری کوردستان ئارامی و سەقامگیری بەخۆیەوە دەبینێت ئەوجا ئەو تەرمە پیرۆزە بگوێزرێتەوە بۆ گوندی باخەکۆن. لەگەڵ تەوابوونی گێڕانەوەی وەسیەتەکەدا زیاد لە سەد کەس لە موریدەکانی ئەو حەزرەتە هەستانە سەر پێ و هاواریان کرد (کاتێك دەتوانن ئەو تەرمە پیرۆزە لەشارەکەمان ببەنە دەرەوە کە خوێنی ئێمە بڕژێنن و بەسەر لاشەماندا هەنگاو بنێن. پاشان وتاربێژی مزگەوتی گەورەی سنەو کۆمەڵێك زانای ئاینی ئەو شارە بەڵگەی شەرعیان هێنایەوە لەسەر بنەمای فەرموودەی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیەوسلم) کەوا مرۆڤ لەهەر وڵاتێك کۆچی دوایی کرد دروستە هەرلەو وڵات و شوێنەدا ئەسپەردە بکرێت. بەوهۆیەوە بڕیاریاندا لەپاش غوسڵ کردنی و نوێژی عەسر تەرمەکەی ببرێت بۆ مزگەوتی گەورەو نوێژی مەیتی لەسەر بخوێنرێت چونکە بەهۆی قەرەباڵغی و حەشاماتی موریدەکانەوە کە بێ ئەندازە زۆربوو لە هیچ مزگەوتێکی دیکەدا جێگەی نەدەبویەوە.

پاش تەواوبوونی نوێژ لەسەر تەرمی پیرۆزی مەراسیمی تەشیع جەنازەی ئەو حەزرەتە بەرەو گۆڕستانی شێخ حەمە باقر (کە لەسەر تەپۆلکەیەکە) دەستی پێکردو ڕێپێوانێکی مەزن لەلایەن هاووڵاتیانی شاری سنەو شارەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتەوە ئەنجامدرا

بەشێوەیەك كە دواتر لە ڕاگەیاندنەكانی دەرەوەو ناوەوەی ئێران بڵاوكرایەوە كە ئەو تەشیع جەنازەیە ڕێپێوانێكی سەد هەزار نەفەری بووە.

لەو تەشیع جەنازەیەدا زانا ئاینیەكان و پیاوماقوڵانی شارەكە لە پێشەوە بوون و ئێمەش لەڕیزی دووهەمدا بووین كاتێك گەیشتینە شەقامی قەتارچیان لەناكاو پیرەمێردێكی گۆپاڵ بەدەست لەبەردەم ڕێپێوانەكەدا پەیدابوو وەدەستی كرد بەڕۆیشتن لەپێش زاناو پیاو ماقوڵەكانەوە وەلەحاڵێكدا كە بەتوندی گۆچانەكەی دەدا بەزەویدا بەدەنگێكی پڕ لەسۆزو تەئسیرەوە سەڵاواتی دەنارد بۆ ڕۆحی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیەوسلم) وەلەمیانەی سەڵاواتەكانداو بەو دەنگە كاریگەرەیەوە ئەم ڕستانەی بەڕۆحی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) دەووت (ئای گوڵ ئەحمەد گیان[٣٥] ویستی خودا ئەوەبوو كە بەجێمان بهێڵیت ئای نەیانهێشت موسوڵمانان سودمەند بن لەڕۆحی موبارەكت بەڕاستی تۆ شایانی ئیرشاد بوویت گوڵ ئەحمەد گیان) بەبیستنی ئەو موناجات و ووتە پڕ لە سۆزانە لەلایەن خەڵكەكەوە شین وگریان و هاوار دەستی پێكرد، لەگەڵ گەیشتنمان بەگۆڕستانی شێخ حەمە باقر ئەو پیرەمێردە لەبەرچاو وون بوو وەكەس نەیزانی چۆن دیاری نەما بەندە بۆخۆم زۆر نزیك بووم لێیەوە وەبەڕاستی سەرم سوڕما لەوەی كە بەوجۆرە دیاری نەما هەروەها زۆربەی ئەو زانا پایە بەرزانەی كە لەپێشەوەی ڕێپێوانەكەدا بوون باوەڕیان وابوو كە ئەو پیاوە حەزرەتی خدری زیندووە (علیه السلام).

كاتێك تەرمی پیرۆزی ئەو حەزرەتەیان گەیاندە سەر تەپۆڵكەی شێخ حەمە باقر قەرەباڵغی موریدو مەنسوبەكان بێ شومار بوو وەبووە هۆی ئەوەی بەناچاری پەلە بكرێت

---

[٣٥] حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەلای زۆربەی پەیڕەوانی تەریقەتەكان مەشهور بوو بە (گوڵ ئەحمەد) ............ نووسەر.

لـە ئەسـپەردە کردنیـدا پـێش ئـەوەی شـەودابێت و خەڵکەکـە بکەونـە زەحمەتـەوە. پـاش تەواوبوونی مەراسیمی تەشیع و ئەسپەردە کردنـی تـەرمی پـیرۆزی حـەزرەتی شـێخ ئەحمـەد (قدس سره) بۆمـاوەی سـێ ڕۆژ مەراسـیمی تەعزیـەو سەرەخۆشـی لەمزگـەوتی (نـەبی)دا بەڕێوەچوو هەروەها بۆماوەی زیاتر لە دە ڕۆژ لەدوای کۆتـایی هـاتن بەتەعزیـەی مزگـەوت موریدو مەنسوبی دڵسۆزو بەمەحەبەتی ئەو حەزرەتە خانەقایان بەجێ نەهێشـت و هەمیشـە هاوخـەمی خۆیـان لەگـەڵ بنەماڵەکەیـدا دەردەبـڕی و دڵنـەواییان دەکـردین لەڕاسـتیدا بـەوکارەیان توانیـان سـەبوری دڵـی غـەریب و نائومێـدی بنەماڵەکـەی بدەنـەوە، خـودا پاداشتیان بداتەوەو هەردەم سەرکەوتویان بکات لەژیاندا.

لەشـەوی چـوارەمی سەرەخۆشـیەکەدا جـەنابی مامۆسـتا مـەلا عوسمـان عبـدالعزیز (بەڕەحمـەت بێـت) تەشـریفی هێنـا بـۆ خانـەقا پـاش خوێنـدنی سـورەتی فاتیحـە موریـدو مەنسوبەکان پێیان ڕاگەیاند (بەهۆی ئەو شارەزاییە فراوانەی کە جـەنابت لەشـەرعدا هەتـە وەئەگەر وەرەسەی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) ڕازی بن ئێمە داوات لێ دەکەین جەنابت ئیرسی ئەو حەزرەتە لە نێوان واریسەکانیدا دابـەش بکـەیت). لەگـەڵ کۆتـایی ئـەم قسـانەو ڕەزامەندی وارسەکان جەنابی مامۆستا فرمێسك هاتە خوارەوە بەچاویداو زۆر غەمبار بـوو موریدەکان لێیان پرسی هۆی چیە وائەوەندە غەمبار بوویت لەپاش ئەو داواکاریەمان؟

لەوەڵامیاندا فەرمووی (پاش ئەوەی ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت ڕۆیشتم بۆ خزمـەت حەزرەتی حسـامەدین (قدس سره) بۆئـەوەی تەمەسـوکی تەریقـەت وەرگـرم لەبەرئـەوەی لـەو سـەردەمەدا بوبـو بەنـەریت بـۆ زانـا ئاینیـەکان کـە لـەپاش وەرگرتنـی ئیجـازەی زانسـتە شەرعیەکان دەبوایە بگەن بە پلەکانی تەزکیەی نەفس و ئادابی تەریقەت وەئەو کارەش بەبێ مورشیدی کامیل و موکەمیل ئەستەمە بێتەدی بەوهۆیەوە من و کاکە عومەری برام ئـەو

حەزرەتەمان بە مورشیدی خۆمـان قـەبوڵ کـرد ، پـاش ئـەوەی کاکـە عومـەرم تەمەسـوکی وەرگرت منیش لە خزمەتیدا دانیشتم و تەمەسوکم وەرگرت کاتێك دەستی پیرۆزیم زیارەت کردو هەستام کە لـە خزمەتیـدا مورەخـەس بم چـاکی کەواکـەمی گـرت و فـەرمووی مـەلا عوسمان ئاگات لە ئەولادەکانم بێت. ئەوکاتە حاڵی نەبووم لە فەرمایشتی ئەو حەزرەتە بەڵام ئێستا بۆم دەرکەوت کە مەبەستی چی بوو).

بۆماوەی شەش ساڵ لەپاش وەفاتی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) بەنـدە لەخزمـەت بەدیعە خانمی دایکمدا (خودا تەندروستی پێ ببەخشێت و تەمەن درێـژی بکـات) لەشـاری سنە ماینەوە وەئەو خانمە مەزنە سەرپەرشتی ناڕاستەوخۆی خانەقاو موریـدو مەنسـوبەکانی دەکردو لەگـەڵ ئەمانەشـدا یارمەتیـدەرو پشـتیوانێکی بـەهێزی مـن بـوو بـۆ تـەواوکردنی زانستە شەرعیەکان و جێبەجێ کردنی ئەرکی ئیرشادو ڕێنوێنی موریدەکانی ئەو حەزرەتە.

شایانی باسە حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) سێ ژنی هێناوە:

١ـ مەریەم خانی کچی جەنابی شێخ موعتەسەم (بەڕەحمەت بن) کە (ساراو عبدالرحمان)ی لـێ بووە.

٢ـ حەدیقە خانی کچی جەنابی شێخ عوسمانی بیارە (بەڕەحمەت بـن) کە (جوان و تاراو عیرفـان و لوقمان و کۆسار)ی لێ بووە.

٣ـ بەدیعە خانی کچی عیزەت بەگی جاف (بەڕەحمەت بێت) کە (عەلی و عادل)ی لێ بووە.

لەپاش شەش ساڵ نیشتەجێ بوونمان لەشاری سـنە گەڕاینـەوە بـۆ باشـوری کوردسـتان کـە دەکاتە بەهاری (١٩٩٦)ی زاینی شوکر بۆ خودا ئێسـتا تەدریسـی زانسـتە شـەرعیەکان و خەتمەو زیکـری خانـەقای حـەزرەتی شـێخ ئەحمـەد (قدس سره) لەشـاری هەڵەبجـەی شـەهیددا دووبارە دەست بەکار بوەتەوەو لەگەڵ ئەوەشدا جێگەو پەنای هەژاران و لێقەوماوانە هەروەها

موریـدو مـەنسـوبەکانی ئـەو ڕێبـازە پـیرۆزە لەهـەمـوو پارچـەکانی دیکـەی کوردسـتانەوە سەردانی دەکەن.

(بەیتی فارسی):

غرض نقشیست کز ما بازمانـد　　　　کـه هستی رانمی بینم بقایی

مگر صاحب دلی روزی به رحمت　　　　کند در کار درویشان دعـای[٣٦]

(شێخ سەعدی شیرازی) (بەڕەحمەت بێت)

❊　　　❊　　　❊

وصلى الله على سيدنا وحبيبنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم
وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

❊

[٣٦] واتە: مەبەستم نەقشێکە کە لەپاش خۆم بەجێم هێشتبێت چونکە بـاوەڕم بەوەنیـە دروسـتکراوەکان هەمیشە بمێننەوە　　لە ژیاندا هیوام بەوەیە کە کەسێکی ئـەهلی دڵ ڕۆژێـك ئـەم نووسـراوەی بەنـدەی هەژاری بەرچاو بکەوێت و لە نزاکانیدا ڕەحمەتم بۆ بنێرێت ..................... نووسەر.

## ( شەجەرەی نەسەبی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) )

حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەساداتی نعێمە و ئەولادەی حەزرەتی حوسەینەو ڕەچەڵەکی دەگاتەوە بە پێغەمبەری خودا (صلی الله علیەوسلم) بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

( (حەزرەتی شێخ ئەحمەد نورالدین ـ حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم ـ حەزرەتی شێخ محمد عەلی حسامەدین ـ حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی یەکەم ـ حەزرەتی شێخ عوسمان سراجەدین (تەوێڵە) ـ خالد ئاغا ـ عبدالله ئاغا ـ سەید محمد ـ سەید دەروێش ـ سەید موشەڕەف ـ سەید جومعە ـ سەید زاهر ـ سەید نعێم ـ سەید شەمسەدین محمد ـ سید عبدالرحیم ـ سەید سەیفەدین عوسمان ـ سەید حەسەن ـ سەید محمد عەلی ـ سەید حازم أبو الفواریس ـ سەید ئەحمەد ـ سەید عەلی مورتەزا ـ سەید أبو الفضائل عەلی ئەشبیلی ـ سەید ریفاعە حەسەن المکي ـ سەید مەهدی المکي ـ سەید محمد أبو القاسم ـ سەید حەسەن قاسم ـ سەید موسا ـ سەید أبو عبدالله الحسین ـ سەید عبدالرحمان المحدث ـ سەید ئەحمەد ـ سەید ئەحمەد ساڵح الأكبر ـ سەید موسا ـ سەید ئیبراهیم مورتەزا ـ ئیمام موسای کاظم ـ ئیمام جەعفەری صادق ـ ئیمام محمد باقر ـ ئیمام عەلی سەجاد ـ ئیمام حوسەین سید الشهداء ـ حەزرەتی فاتیمەی زەهرا (خودا لێیان ڕازی بێت) ـ حەزرەتی محمد المصطفی (صلی الله علیەوسلم) ) ).

*　　　*　　　*

## (سیلسیلەی بنەڕەتی ئیرشادی حەزرەتی حسامەدین و جێگەدارەکانی (قدس سرهم))

(حەزرەتی شێخ عوسمان سراجەدین ـ تەوێڵە)

|

(حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی یەکەم)

|

(حەزرەتی شێخ محمد عەلی حسامەدین)

|

(حەزرەتی شێخ محمد بەهائەدینی دووهەم)

|

(حەزرەتی شێخ ئەحمەد نورەدین)

|

(حەزرەتی شێخ محمد عەلی مولەقەب بە ثاني حسام الدين)

(قدس الله اسرارهم العلية)

❊ ❊ ❊

## وێنەی ژمارە: (١٧)



**(مەرقەدی حەزرەتی شێخ ئەحمەد نورەدین (قدس سره) لەشاری سنە)**

**تێبینی: ئەم مەرقەدە لەلایەن ئاغای بەهائەدینی ئەدەبەوە (بەڕەحمەت بێت) دروست کراوە کە یەکێك بووە لە موریدە بەوەفاکانی ئەو حەزرەتە پاشان ئاغای عەلی خانی ئەمیری بە نوێنەرایەتی نووسەر نۆژەنی کردەوە.**

## وێنەی ژمارە: (١٨)



(مەراسیمی ڕاگەیاندنی جێنشین بۆ حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره))

لەلای ڕاستەوە:

١ـ جەنابی شێخ کەمالی حسامی نەقشبەندی.

٢ـ نووسەر لەکاتی بەستنەوەی مێزەرەی ئیرشادو جێگەداری ئەو حەزرەتەدا.

٣ـ مەرحومی شێخ عبدالملك حسامی.

## وێنەی ژمارە: (١٩)



**(موبارەك بایی خەلیفەو موریدەکانی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لە نووسەر پاش لەبەرکردنی عەباو مێزەرەی ئیرشاد)**

## وێنەی ژمارە: (٢٠)



(ئەم وێنەیە لەپاش گەڕانەوەی نووسەر لەئیرشادی ناوچەکانی ژاوەڕۆو کەڵاتەرزان گیراوە)

## وێنەی ژمارە: (٢١)



لەلای ڕاستەوە:

١ـ جەنابی شێخ کەریمی حسامی لەتەمەنی لاویدا.

٢ـ حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره) لەتەمەنی لاویدا.

## وێنەی ژمارە: (٢٢)



**لەلای ڕاستەوە:**

**١ـ نووسەر.**

**٢ـ حاجی مەلا ئەحمەدی گۆبان خەلیفەی حەزرەتی شێخ ئەحمەد (قدس سره).**

## وێنەی ژمارە: (٢٣)



(نووسەر لەکاتی ئیرشادی وڵاتی تورکیادا)

لەلای ڕاستەوە:

١ـ نووسەر.

٢ـ جەنابی شێخ عبدالباقی خەلیفەی نووسەر لەتورکیا، وەکۆمەڵێك لەموریدەکانی ئەو وڵاتە لەدەوریاندا.

## وێنەی ژمارە: (٢٥)



(خانەقای حەزرەتی شێخ ئەحمەدی حسامی (قدس سره) لەشاری هەڵەبجەی شەهید)

## وێنەی ژمارە: (٢٦)



لەلای ڕاستەوە:

١ـ ئاغای عەلی خانی ئەمیری.

٢ـ نووسەر.

## وێنەی ژمارە: (٢٧)



لەلای ڕاستەوە:

١ـ مەرحومی حاجی کاکە شێخی حسامی.

٢ـ نووسەر.

# (( پێڕست ))

**ناونیشان**

**لاپەڕە**

ناونیشان

لاپەڕە

## ( نووسەر لەچەند دێرێکدا )

وێنەی ژمارە: (٢٨)



مورشیدو ئوستادمان حەزرەتی شێخ محمد عەلی (قدس سره) ناوی تەواوی (محمد عەلی ئەحمەد محمد حسامی نەقشبەندی)ەو مولەقەب بە (ثاني حسام الدين)ە لەساڵی (١٩٧٥)ی زاینیدا لەشاری سلێمانی لەدایك بووەو دانیشتووی شاری هەڵەبجەی شەهیدە. لەساڵی (١٩٩٠)ی زاینی لەسەر وەسیەتی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی باوکی (قدس سره) بووە بەجێگەداری و ئیرشادو سەرپەرشتی موریدەکانی ڕێبازی حسامی نەقشبەندی کردوە. هەروەها ساڵی (١٩٩٣)ی زاینی ئیجازەی زانستە شەرعیەکانی لەخزمەت مامۆستا مەلا عبداللهی گوڵپیدا (بەڕەحمەت بێت) وەرگرتووە، وەلەساڵی (١٩٩٦)ی زاینیدا لەڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە گەڕاوەتەوە بۆ زێدی خۆی و خانەقاو تەکیەو مەدرەسەی زانستە شەرعیەکانی هەڵەبجەی ئاوەدان کردوەتەوەو لەئێستادا سەرپەرشتی موریدەکانی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی باوکی (قدس سره) دەکات لە ناوچەکانی باشورو باکورو ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا.

❊ ❊ ❊

**اللهم نسألك دوام نعمت بقائه علينا وعلى سائر المسلمين المؤمنين بجاه النبي القوريشي الأمين وآله الطاهرين وصحابته المنتجبين**